# بمبوورە
# من هەڵە بووم!

## بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی
## و
## بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی

## خۆشەویستی
## راستەقینە!

## سەرکردایەتی بۆماوەیە یا دەسکەوتە؟

## بۆنی تۆ ئەمڕۆ
## لە بۆنی دایکم دەچێت!

## منداڵ و بەکارهێنانی مۆبایل

The first Magazin Especializined in Management and Human Development in Kurdistan

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی دووەم - ژمارە 22 - ئازاری 2010





تیراژ: 3000 دانە

چاپخانەی سەردەم




بۆ دابەشکردنی بڕیار

هەولێر: خانەی سیروان ۰۷۵۰٤٦۷۲۹٦۳
کەرکوک: ۰۷۷۰۸٥٦۳۷۲٤ هەڵەبجە: ۰۷۷۰۱۹۳۳۹٦۷ -۰۷۵۰۱۱۲۹٤۲۷ دەربەندیخان:
۰۷۷۰۱٥۸۱۰۱۸ کفری: ۰۷۷۰۱٥٦٦۸۷٦ کەلار: ۰۷۷۰۲۱۰۱۲۸۸
چەمچەماڵ: ۰۷۷۰۸٥٥۰٥۸٦ کۆیە: ۰۷۷۰۱٥٤۹۷۱٤ سۆران: ۰۷٥۰٤٥۰۱۹۳۳
چۆمان: ۰۷٥۰٤٥٦۷۹۹۲ قەڵادزێ: ۰۷۷۰۱٥۸٥۲۰۱ ڕانیە: ۰۷۷۰۱٥۸۰٤٤۲



ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری سلێمانی مۆڵ- نهۆمی دووەم
بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە
۰۷۷۰۲۱۷۸٦۸۲ ۳۱۹۳۹٤٦
E-mail: bryarmagazin@gmail.com
هەولێر ۰۷۵۰۷٦٥۸٥۳٥ ۰۷۵۰٤٤٦۳۲۳۰

# هەرەس

خاڵۆ بەم پیری و بێتاقەتییە..
بۆ پێت پەتییە؟
ڕۆڵە دواترین دیمەنی هەرەس
وا لەنێو سینگی ئەم ڕۆژگارەدا
کەس جوتێ پێڵاو
نابەخشێ بەکەس.....

موحەمەد کوردۆ

ئەم لاپەڕەیە بە سپۆنسەری
گروپی کۆمپانیاکانی ڕسەن بڵاو دەکرێتەوە

# پەرەپێدانی کارگێڕی لە نێوان دروشمو واقیعدا!!

لەگەڵ هەموو قۆناغێکی نوێو گۆڕانکارییە سیاسیو ئابورییە جۆربەجۆرەکاندا وشەو دروشمی نوێو ئاوازە دێنە مەیدانو سیاسەتمەدارو سەرکردەکان وتارو بەرنامەی کاری خۆیانی پێ دەڕازێننەوە، هەڵبەت ئەو وشەو دروشمانە زۆرجار زڕەو زایەڵەیەکی خۆشاوازی لە گوێدا هەیەو جێگای دڵنیاییو خۆشحاڵی دەبێت لەلای گوێگرانی.

چونکە ئەو کەسانەی کە خوێندنەوەی قووڵیان نییە بۆ دروشمەکان زۆر بە سادەیی بۆ شتەکان دەڕوانن.

لەو دروشمانەی کە زۆر بەر گوێمان دەکەوێت پەرەپێدانی کارگێڕیو مرۆییو پتەوکردنی سیستەمی کارگێڕییە، کە بەردی بناغەی هەموو پێشکەوتنو گەشەپێدانێکە.

بەڵام ئەم کارە هێندەی پێویستی بە بەرنامەڕێژیو پلاندانانو چاودێری هەیە، هێندە پێویستی بە وتاری حەماسیو وتەو دەستەواژەی بریقەدار نییە.

ئەمڕۆ لە زەمەنی عەولەمەو سەردەمی زانیاریو پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو هاتنەگۆڕێی سیستەمە نوێیەکانی کارگێڕیو بەڕێوەبردندا، زۆر گوتن هیچی پێ ناکرێتو کردار دەتوانێت بوونی لە گۆڕەپاندا بسەلمێنێت.

هاوکات تەرخان کردنی پارەی بێ شومارو بودجەی موفت بێ هیچ بنەماو بەرنامەیەك جگە لە زێتر شێواندنی سیستەمی کارگێڕیو بە فیڕۆدانی سامانی وڵاتو بەدکارگێڕیو گەندەڵی هیچی تری لێ ناکەوێتەوە.

سادەترین پێناسەی بەڕێوەبردن وەکو تایلۆر دەڵێت: ئەوەیە کە بە تەواوەتی بزانیت چیت دەوێت؟!

کەواتە خاڵی دەستپێکردن ئەوەیە کە بزانین چیمان دەوێت؟

دواتر دەکرێت بزانین پێویستە چی بکەین بۆ گەیشتنمان بەو ئامانجانەی دیاریمان کردوون!!

کارگێڕی زانستو هونەرە، پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی بەردەوامە لە وەبەرهەمهێنانی بەروبوومە بەردەستەکان بە سروشتیو مرۆییەوە لە ڕێگای پلاندانانو ڕێکخستنو سەرکردایەتیو چاودێری وردەوە بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەی بیان گەینێ.

کارگێڕی توانای دروستکردنی بڕیاری ژیرانەیە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان لە چوارچێوەی کاتێکی دیاریکراودا.

کارگێڕی ئاکارو ڕەفتارو پیادەکردنە لە چوارچێوەی بەرژەوەندییە نیشتمانییەکاندا.

بۆ گەیشتن بە پەرەپێدانی کارگێڕی پێویستمان بە پلاندانان هەیە، نەك تەنها وەزارتێك بەو ناوەوە!

پێویستمان بە ڕێکخستن هەیە لە چوارچێوەی وڵاتو حکومەتو دەزگادا، نەك تەنها لە جوغزی ڕێکخستنی حیزبیدا!

پێویستمان بە سەرکردایەتی لێهاتوو شایستە هەیە کە بە واقیع بیسەلمێنێت بەڕاستی ڕابەرو شایستەی سەرکردایەتییەو دەزانێت هونەری سەرکردایەتی چییە!!

کارگێڕیو بەڕێوەبردن چاودێریو وردبینییە، چونکە وەکو گوتراوە: ماڵی بەربڵاو دز دروست دەکات!

گەشەپێدانی کارگێڕیو پێشکەوتنی سیستەمی بەڕێوەبردن، بەکارهێنانی وزە مرۆییەکانی دەوێت، ڕاهێنانو مەشقکردنی دەوێت.

دەکرێت لە خۆمان بپرسین چی لەم کارانە کراوە، بۆ پەرەپێدانی کارگێڕیو زیندە بە چاڵکردنی ڕۆتین.

وەختێك وڵاتانی جیهان سیستەمە پێشکەوتووەکانی کارگێڕیو بەڕێوەبردن پیادە دەکەنو حکومەتەکانیان لە ڕۆتینو گەندەڵی پاك دەکەنەوەو نوێترین تەکنەلۆژیای زانیاری بەکاردەهێنن، هەندێکیان بە حکومەتی بێ کاغەز ناوزەد دەکرێن، ئێمە دەزگاکانمان لە دەریای فایلو کاغەزدا نوقم کردووەو عەرزو حاڵو نووسراوە فەرمییەکانمان بە دەیان واژۆی ڕەنگاو ڕەنگ دەڕازێنینەوە. کەواتە جیاوازی زۆرە لە نێوان وتەی بریقەدارو واقیعی کارگێڕی ئەمڕۆی کوردستاندا.

# کارگێڕی بە گوفتار

داماوترین کەس ئەو کەسەیە کە بڕیارنەدان پیشەیەتی! «ویلیام جیمس»

ژیانی مرۆڤ بە پانی ڕووداوەکانی دەپێورێت، نەک بە درێژی ساڵەکانی! «عەلی تەنتاوی»

هیچ مرۆڤێک ناتوانێت ببێتە زانا پڕ بە مانای وشەکە، تا لەپێشدا مرۆڤ نەبێت پڕ بە مانای وشەی مرۆڤ! «نوفالس»

کەی باڵەخانەکە تەواو دەبێت؟ ئەگەر تۆ بینا بکەیتو کەسانێکی تریش بیڕوخێنن! «صالح عبدالقدوس»

ئەگەر ڕێســـای فیزیایی بڵێت: پاڵەپەســـتۆ دەبێتە مایەی تەقینەوە، ئەوا ڕێسای کۆمەڵایەتی دەڵێت: پاڵەپەستۆ دەبێتە مایەی دووڕوویی کۆمەڵایەتی! «عبدالکریم بکار»

گەورەترین هەڵەمان، سەرقاڵبوونمانە بە هەڵەی کەسانی ترەوە! «ج.خەلیل جوبران»

مرۆڤە بەرزەکان هەوڵی ئەو شـــتانە دەدەن کە لە ناخی خۆیاندایە، بەڵام مرۆڤە نزمەکان هەوڵی ئەو شتانە دەدەن کە لە دەستی کەسانی تردایە! «کۆنفۆشیوس»

# کارگێڕی به چیرۆك

## راستکردنەوەیەکی بەجێ!!

لە وڵاتێکدا گڕی جەنگ هەڵگیرسا دانیشتووان پەنایان بۆ شاخەکان بردو بۆ رزگاربوون لە دۆزەخی جەنگ، لە ماڵو حاڵی خۆیان هەڵاتن.

رۆژنامەوانانی جیهانیش گەیشتنە ئەو شوێنە بۆ بڵاوکردنەوەو پەخشکردنی کارەساتو رووداوەکان، رۆژنامەنووسێك کاتێك سەرنجی ئەو کارەساتە مرۆڤایەتییەی دەداو پۆل پۆل ئاوارەکانی دەبینی شارەکەی خۆیان جێ دەهێڵن... لە نێوانیاندا کچێکی دوانزەساڵانی بینی کە برایەکی چوار ساڵانی خۆی کردبووە کۆڵ و زۆر بە زەحمەت بە دامێنی چیاکەدا سەردەکەوت، ئەمیش لێی نزیك بۆوەو لێی پرسی: تۆی کیژۆڵە بارێکی قورست لەسەر شانت هەڵگرتووە، وانییە؟! کچەکەش بە سەر سوڕمانەوە تەماشای کرد! لە کاتێکدا هەناسە بڕکێی پێکەوتبوو، پێی گوت: ئەمە بارێکی قورس نییە ئەمە برامە!!

لەم چیرۆکەوە فێردەبین:

١- ئەرکەکانمان دەبێت بە جوانترین شێوە ئەنجام بدەینو نابێت بە زەحمەتی تێبگەین.

٢- دەبێت بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە کارەکانمان ئەنجام بدەینو دڵخۆشبین پێی.

٣- هەر کارێك پێویست بێت لەسەرمان ئەنجامی بدەین سەبارەت بە وڵاتو نیشتمانو کەسو کارو مرۆڤایەتی دەبێت چالاکانە پێی هەڵبسینو هیچ درێغی تێدا نەکەین.

٤- لە کاتی ئەنجامدانی کارەکانماندا نابێت وا هەست بکەین کە بێگارمان پێ دەکەن، بەڵکو دەبێت وابیر بکەینەوە کە ئەرکێکە پێویستە لەسەرمان پێی هەڵبسین.

٥- نابێت بەرامبەر بە ئەرکە نیشتمانییەکانمان هیچ منەتێك بکەین بەسەر کەسدا، چونکە ئێمە تەنها بە ئەرکی سەرشانمان هەستاوین.

٦- نابێت تەنها بە پێوەری ماددی رووداوەکان بپێوینو بەو چاوەشەوە سەرنج بدەین، چونکە ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە زۆر ناتەواوە.

٧- پێشکەشکردنی یارمەتیو هاوکاری مایەی دڵخۆشیو شادمانین با زەحمەتو ماندووبوونیشی تێدا بێت.

٨- پێویستە رۆژنامەنووسیش وردبین بێتو تەنها سەرنجی رووکەشی رووداوەکان نەداتو بە ناخی رووداوەکاندا بچێتە خوارەوە.

# سەرەتایەك لە زانستی ڕێکخستن

بەشی پانزەیەم

هاژە شێروانی

لە ژمارەی ڕابـردوودا ئاماژەمان کرد بە (سـەرهەڵدانی یەکەکانی ڕێکخسـتن‌و سـەرهەڵدانی ئاسـتەکانی ڕێکخستن)، لەم ژمارەیەشدا هەوڵدەدەین کە (سەرهەڵدانی یەکەکانی پاڵپشـتی‌و سـەرهەڵدانی کارو چالاکییەکانی ڕێکخسـتن)، لـە زنجیرەی پانزەهـەم بـۆ ئێـوەی خوێنـەری بەڕێز بخەینە ڕوو.

سـێیەم/ سـەرهەڵدانی یەکەکانـی پاڵپشتی:

هـەروەك پەرەپێدانـی ڕێکخسـتن ئاماژەیە بۆ زیادبوونی قەبارەی ڕێکخراوو فراوانبوونی قەبارەی چالاکییەکانی دەبێتە هۆی سـەرهەڵدانی یەکەکانی ڕێکخسـتن‌و ئاسـتە جۆراوجۆرەکانی ڕێکخستن، (وەکو ئـەوەی کە لـە خاڵـی یەکـەم‌و دووەمی ژمارەی ڕابردوو ئاماژەمان پێکرد)و کارەکە تەنها بەوەندەش ناوەستێت، بەڵکو دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئەو یەکانەی کە خاوەن سروشتێکی تایبەتن‌و پێی دەوترێت: (یەکە پاڵپشتەکان Support Unit ).

دوو جـۆر یەکەی پاڵپشـتی هەیە کە بریتین لە:

١- یەکە پاڵپشـتە کارگێڕییـەکان (یان ڕاوێژکارییەکان)
Staff\Administrative Support Units

٢- یەکە پاڵپشتە هونەرییەکان
Technical\Professional Support Unit

١- یەکـە پاڵپشـتە کارگێڕییـەکان (ڕاوێژکارییەکان): ئەم یەکانەش لە دەرەوەی هێڵـی دەسـەڵاتی جێبەجێکردنە، ئەمەش خاوەن سروشـتێکی ڕاوێـژکاری یان کارە بە واتـای ئەوەی کە (خزمەت‌و هاریکاری‌و ئامـۆژگاری‌و ڕاوێـژو زانیـاری‌و ڕاو زۆر کەمیش هەڵدەسـتێت بە جێبەجێ کردنی کارەکان) دەگرێتە خۆی، ئەمەش بەمجۆرە یەکـەی هاوکاریـکارەو ئاسـانکاری دەکات بۆ جێبەجێکاران، ئـەوەی کە بەرچاویش دەکەوێت لەم یەکە پاڵپشـتانە ئەوەیە کە شـارەزاو پسـپۆڕن لە بواری کارەکەیاندا، تەنها ئەوە نەبێت کە لە سـەریانە هەڵسن بە لێکۆڵینەوەو پێشکەشـکردنی خزمەت‌و ئامۆژگاری‌و ڕاوێژ، لە سەر جێبەجێ کارانە کـە قبوڵی بکەن یـان ڕەتی بکەنەوە، هەر وەك هەڵدەستن بە خزمەت کردن‌و هاوکاری جێ بەجێکاران بۆ ئاسـانکاری کارەکانیان‌و لەوانەیە کە ڕوونیشی بکەنەوە.

لـە گرنگتریـن یەکـە پاڵپشتە ڕاوێژکارییەکانیش بریتین لە:

* سکرتاریەت.
* گواستنەوەو گەیاندن.
* پەیوەندی گشتی.
* کڕینەکان.
* بە کۆگاکردن.
* چاککردنەوەی گشتی.
* خزمەتگوزاری گشـتی (چێشتخانەو پۆستە......)
* سـەرچاوەی مرۆیـی (پەیوەنـدی پیشەسازی).
* کاروباری یاسایی.

بە تێبینی کردنی ئەوەی کە دەسەڵاتی ئـەم یەکانـە دەکەوێتە نێوان دەسـەڵاتی ڕاوێژکاری‌و دەسەڵاتی کارەکان.

دەسەڵاتی ڕاوێژکاریش: ئەو دەسەڵاتەی ڕاوێـژو پێدانـی ڕایـە کـە دەتوانرێـت ڕەتبکرێتەوە یان قبوڵ بکرێت.

هەرچی دەسەڵاتی کارەکانە: بە واتای توانای پێشکەشکردنی خزمەتی دیاریکراو

کە جێبەجێ دەکرێت لە شوێنی ترو سەر بەو یەکانە نییە کە پێشکەشی دەکات، هەروەك پەیوەندی گشتی لەوانەیە ئاهەنگێك ڕێکبخات بۆ یەکێك لە کارگێڕییەکان، کارگێڕی سەرچاوەی مرۆیی کاری کاروباری کرێکاران ڕێکدەخات لە هەموو کوچەو کەلەبەرێکی ڕێکخراو، هەڵدەستێت بە ئەداکردنی هەندێك ژمێرەری کارگێڕییەکانی تر، هەمان مەنتیقیش سەبارەت بە کڕین، بە کۆگاکردن، چاکسازی، خزمەتگوزاری گشتی، گواستنەوەو گەیاندنو... هتد.

لە یەکە پاڵپشتە کارگێڕییەکان (یان ڕاوێژکارییەکان).

٢- یەکە پاڵپشتە هونەرییەکان: ئەم یەکانەش هەر لە دەرەوەی هێڵی دەسەڵاتی جێبەجێکردنن، خاوەن سروشتێکی ڕاوێژکاری یان کارن، ئەرکەکەشی بریتییە لە دیزاین کردنی سیاسات، دارشتنی سیستەمو مامەڵەکردن لەگەڵ زانیاری، ئەم کارگێڕییانە یان یەکانە هەر وەك ژێری ڕێککاران (العقل المدبر) لە ڕێکخراوە گەورەکان، لەم یەکانە گەورە پسپۆڕان کاردەکەن لە هەڵگرانی پلە زانستییە باڵاکان، هەر ئەوانیشن دان پیانەرنو پیشەوەرن لە بواری کارەکەیان، هەڵدەستن بە پلان دانانو چاودێری دامەزراوەییو ئامادەکردنی بۆ فراوان بوونە هونەریو بەرهەمدارییەکان، دەگەڕێن بە دوای گرفتی بازارو ڕکابەری کردنیو وردترین توێژینەوەش بۆ ڕێکخراو ئامادە دەکەن.

لە گرنگترین یەکە پاڵپشتە هونەرییەکان بریتین لە:

* پلانی ستراتیژی.
* هەڵسەنگاندنی ئەدای دامەزراوەیی.
* توێژینەوەو پەرەپێدان.
* سیستەمی زانیاریو پاڵپشتی بڕیاردان.
* وردبینو چاودێریو پێداچوونەوە.
* دیزاینی ئەندازەیی.
* دیراساتی هونەری.
* بەخشتەکردنی بەرهەم هێنان.
* لێکۆڵینەوەی کارکردنو ڕێکخستن.
* پەرەپێدانی دوارۆژی کار.
* جۆری کوالێتی پێوانەکردن.
* داهێنان.

تێبینی ئەوە بکەن کە ئەم یەکانە کار دەکەن لە ڕێگای پسپۆڕە لێزانەکان لە بواری کارەکەیان، زۆر لێزانیشنو ڕاهێنراون لەسەر توێژینەوەو دیراسەو وردبینی، ئەمەش بە مەبەستی پێشکەش کردنی پاڵپشتی هونەری، کارەکانیشیان لە شێوەی سیستەمی کارو پلانی درێژخایەن، ڕاسپاردەکان، یاساو ڕێساکان، سیاسەتی کارکردن، ڕێو شوێنی دوورو درێژ دەبێت، لە دوایدا هەر ئەوانەن کە وێنەی دوارۆژی ڕێکخراو دەکێشن، سیستەمەکەی دادەنێنو چاودێری ئەدای گشتی دەکەن.

ئەم یەکانەی کە باسمان لێوە کرد خاوەن سروشتێکی تایبەتنو لە ژێر ناوی تر دەردەکەون وەك:

* نووسینگە.
* یەکە.
* مەڵبەند.

هەر بۆ نموونە دەبینین کە ئەم ناو لێنانە لە یەکە پاڵپشتە هونەرییەکانی وەکو ئەمانەن دەبنە: مەڵبەندی زانیاری، نووسینگەی هونەری، نووسینگەی ئەندازەیی، یەکەی پاڵپشتی بڕیار، یەکەی دیزاینی ئەندازەیی، نووسینگەی پێداچوونەوەو وردبینی، نووسینگەی پلانی ستراتیژی، یەکەی هەڵسەنگاندنی ئەدای دامەزراوەیی، نووسینگەی لێکۆڵینەوەی کارو ڕێکخستن.

دەسەڵاتی تایبەت بەم یەکە پاڵپشتە هونەرییانە گوزارشت دەکات لەو دەسەڵاتە ڕاوێژکارییەی لە شێوەی ئامۆژگاریو ڕاوێژەکە قبوڵ دەکرێت لەبری نەبوونی، یان دەسەڵاتی کارەکەیە بە واتای ئەو یەکە هونەرییە دێت کە هەڵدەستێت بە پێشکەش کردنی کارو خزمەتگوزاری بۆ بەرژەوەندی یەکەکانی تر (لە زۆربەی جاردا بۆ بەرژەوەندی کارگێڕی باڵایە).

چوارەم/ سەرهەڵدانی کارو چالاکییەکانی ڕێکخستن:

هەروەك کە پێشتر ڕوونمان کردەوە کە ڕێکخستن لە پاڵ ئەوەی کە هەرەم پەیکەر بەندە لە هەمان کاتیشدا ڕێگاو چالاکی کاری تایبەتە بە ڕێکخستنی کار **Organizing** و هەر ئەوەش کە بەڕێوەبەر پێی هەڵدەستێت کاتێك کە دەسەڵاتی بە ئاسانیی دیاری دەکرێت بە واتای چالاکیو کارە داواکراوەکان، ئەمەش بۆ گەیشتن بە هەر ئامانجێك، بە هەر ڕێگایەکو تاکێك، لە هەر کاتێك، بە هەر شێوازێك بێت کە هەماهەنگی لە نێوان هەموو کارەکان دەکات، بە چ شێوازێکیش دەتوانێ ململانێیەکان چارەسەربکات.

لەسەر ئاستی ڕێکخراویش هەندێك لە یەکە پاڵپشتە هونەرییەکانو ڕاوێژکارە دەرەکییەکان هەڵدەستن بە کێشانی سیاسەتی ڕێکخستن کە ڕێککاری پەیوەندییەکانو دەسەڵات دەکات لە نێوان ئەو یەکانەی کە ڕێکخراوی لێ پێك دێت، ئەم لیستەی خوارەوەش گرنگترین ئەرکو چالاکییەکانی ڕێکخستن دەردەخات کە بەم شێوەیەیە:

لیستی گرنگترین ئەرکو چالاکییەکانی ڕێکخستن:

١- دیاری کردنی ئەرکو کاری بەردەستەکان.

٢- دیاریکردنی ڕێو شوێنی جێبەجێکردنی بەردەستەکان بۆ کارەکانیان.

٣- دەسەڵات پێدان بە بەردەستەکان.

٤- بەشداری پێکردنی بەردەستەکان لە بڕیاردان.

٥- کارگێڕی کۆبوونەوەو لیژنەکان.

٦- بنبڕکردنی ململانێ لە نێوان بەردەستەکان.

٧- دەرکردنی فەرمانو ڕێنمایی تایبەت بە کار.

٨- کارگێڕی فرۆفێڵە سیاسیەکان لە کار.

٩- وەسفکردنی پسپۆڕییەکانی ڕێکخستن (بە واتای ئەرکی یەکەکان).

١٠- ئامادەکردنی خشتەی سپاردنی دەسەڵات (دەسەڵاتی یەکەکان).

١١- وەسفکردنی کارەکان.

١٢- ئامادەکردنی ڕێبەری ڕێکخستن.

١٣- پەرەپێدانو گۆڕینی ڕێکخستن.

١٤- ئامادەکردنی بەڵگەو گرتنەبەری ڕێو شوێن.

١٥- وێنە کێشانی ڕۆشنبیری ڕێکخستن.

ئەوەی کە سەیرە لێرەدا ئەوەیە کە بەڕێوەبەران لە پێگەی کارەکەیان ئەم ئەرکو چالاکییانەی ڕێکخستن فەرامۆش دەکەن، ئەمەش بەوەی کە وادەزانن کە گرنگیدان بە هونەری ئەدای کارکردنیان لە بوارەکانی بەرهەمهێنانو بە بازاڕخستنو فرۆشتن گرنگترە لەم ئەرکانەی ڕێکخستن، فەرامۆش کردنی ئەم ئەرکو چالاکیانە لە توانای کارەکان کەم دەکاتەوە بە تەواوی، ئەمەش کە بە کورتبینی کارگێڕی دەناسرێت نابێتە هۆی بە توانستی بەڕێوەبەران، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێتە هۆی بە هیلاك بردنیان بە تایبەتی تاوەکو بەرزبینەوە بەرەو ئاستی ڕێکخستن.

هەر بۆیە ڕێکخراوە پێشەواو گەورەکان گرنگی دەدەن بە مەشق پێکردنی بەڕێوەبەرانی لە سەر ئەم ئەرکو چالاکیانەی ڕێکخستن، هەر بڕگەیەك لەم لیستەدا دەربڕی (خولێك یا چەند خولێکە) بۆ مەشق پێکردن کە دەبێت تیایدا بەڕێوەبەران زۆرێك لە زانینو کارزانییەکان وەربگرن تا یارمەتیان بدات لە سەر بنیاتنانی دوارۆژی کارگێڕیو لە سەر بەرزکردنەوەی توانستی ڕێکخراوەکانیان.

# چۆن دامەزراوەکەت پێش دەخەیت؟

و/ ئاوات جەمال

## میکانیزمەکانی بەجێهێنانی پرۆسەی ڕاهێنان

سەرکەوتنی هەر پرۆسەیەکی ڕاهێنان بەندە بە چەند هۆکارێکەوە، یەکێك لەو هۆکارانە میکانیزمەکانی بەجێهێنانی ئەو پرۆسەیەیە. لێرەدا چەند میکانیزمێك دەخەینە ڕوو تاکو پرۆسەی ڕاهێنان بە شێوازێکی گونجاوو ڕێکوپێك بەڕێوە بچێت:

١- هەستە بە پێداچوونەوەی نەخشەی ستراتیژیو ئامانجە زانستییەکانت: پێویستە ڕاهێنان هەمیشە پەیوەست بێت بە پلانو ستراتیژییەکانی کۆمپانیاکەت، بۆیە دەبێت ئەو مەبەستو ئامانجە دیاری بکەیت کە دەتەوێت پێی بگەیت، بەر لەوەی ڕاهێنان بە فەرمانبەرەکانت بکەیت.

٢- مەرجە ئەو ڕاهێنانەی ئەنجامی دەدەیت پەیوەندی بە ئامانجەکانی کۆمپانیاکەتەوە هەبێت: بە مەبەستی دانانی بەرنامەی ڕاهێنانو بڕیاری بە ئەنجام گەیاندنی لەبەرئەوە نەبێت کە ڕاهێنان بووە بە نەریتێك لە دامەزراوەکاندا، یان لەبەرئەوەی شتێکت لە کتێبێك یاخود گۆڤارێکدا خوێندۆتەوە، یاخود بە بیانووی ئەوەی هەندێ کۆمپانیا ئەو شێوازە ڕاهێنانەیان ئەنجام داوە.

٣- هەڵسە بە پێداچوونەوەی ئەو سکاڵایانەی کە لە لایەن بریکارو کڕیارەکانتەوە بە دەستت گەیشتووە: ئەو ئەرکو فەرمانانە کامانەن کە فەرمانبەرەکانت بە کارامەییو لێهاتوویی ئەنجامی دەدەن، لە پێناو بە دەستهێنانی بریکارو کڕیاری زیاتردا، خودی سکاڵاکانیش هاندەرو هۆکارن بۆئەوەی ڕاهێنان ئەنجام بدرێت.

٤- بەو کارو چالاکیانەدا بچۆرەوە کە خاڵی سەرەکی دامەزراوەکەتنو فەرمانبەرەکانت ئاماژە بە کەموکورتی دەکەن تیایدا، لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاپۆرتانەی کە لە لایەن یەکە کارگێڕییەکانەوە ئامادە دەکرێن، کەموکورتیو کەمتەرخەمییەکان دیاری بکەو هەوڵبدە لە میانی داڕشتنی بەرنامەی کاری ڕاهێنانەکەدا ڕێوشوێنی چارەسەرکردنیان دیاری بکەیتو زاڵبییت بە سەریاندا.

٥- ڕوونکردنەوە دەربارەی بەرنامەی کاری ڕاهێنانەکە پێشکەش بکە: لەگەڵ سەرپەرشتیارانی یەکە کارگێڕییەکان کۆببەرەوەو بیاندوێنەو لە پێداویستییەکانیان بکۆڵەرەوە، بزانە ئەو شتانە چین کە پێویستە لە بەرنامەی ڕاهێنانەکەدا لەبەرچاو بگیرێن تا ئاستی هۆشیارییو لێهاتوویی فەرمانبەران بەرزبکرێتەوەو باشتر کارەکانیان بەجێبهێنن، پاشان ناوەڕۆكو ئامانجی بەرنامەکەیان بۆ ڕوون بکەرەوە.

٦- هۆکارەکانی وازهێنانی فەرمانبەران دەستنیشان بکە: هەوڵ بدە لە میانی گفتوگۆو قسەکردن لەگەڵ ئەو فەرانبەرانەی داوای دەست لە کارکێشانەوە دەکەن، بزانە هۆکاری وازهێنان لە کارەکەیان چییە؟ ئایا بە ویستی خۆیانە یان لەبەر کەمتەرخەمیو خراپی کۆمپانیاکەیە؟ کەواتە هۆکارەکان شی بکەرەوەو لە دانانی بەرنامەی ڕاهێناندا سوودیان لێ وەربگرە، پاشان کێشەو گرفتەکان دیاری بکە تا لە ڕێگەی ئەنجامدانی خولەکانی ڕاهێنانەوە چارەسەریان بکەیت.

٧- چاودێری کارمەندو فەرمانبەرانت بکە تا ئاگاداری گیروگرفتو تەنگژەکانیان بیت: زۆربەی بەرنامەکانی کاری ڕاهێنان لە دامەزراوەکاندا بە مەبەستی چارەسەر کردنی گیروگرفتەکانی سەلامەتی پیشەییو قورسی کارو خراپ بە کارهێنانی کەرەستەکانو شێوازی ئەنجامدانی کارەکانو ئاڵۆزی پەیوەندییە مرۆییەکانو تەنگژە تاکە کەسییەکانو... لە حاڵەتی چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتانە لە ڕێگەی ئەنجامدانی پرۆسەی ڕاهێنانەوە

زنجیرەی چوارەم و کۆتایی

فەرمانبەران نەك تەنها هەست بە لا لێکردنەوەو گرنگی پێدانیان دەکەن، بەڵکو کارامەترو لێهاتوو تر دەبن‌و زیاتر هەست بە ئاسوودەیی دەکەن.

٨- هەڵسەنگاندن بکە بۆ فەرمانبەرانت بە مەبەستی زانینی ئارەزووەکانیان‌و تێڕوانین‌و دیدو بۆچوونیان: لە میانی ئەو گفتوگۆو پرسیارانەی ئاراستەیان دەکەیت دەگەیتە ئەو دەرەنجامەی کە بزانیت چیان پێویستەو چ ڕێگەو شێوازێك لە حەزوو ئارەزووی ئەوان دەگونجێت ئەمەش بە ئامانجی ئەنجامدانی پرۆسەیەکی ڕاهێنانی سەرکەوتوو.

٩- یەکتر بینین‌و سازدانی چاوپێکەوتن‌و گفتوگۆی کراوە لەگەڵ فەرمانبەران‌و دەستە کارگێڕییەکان: وا باشترە لە چاوپێکەوتن‌و کۆبوونەوەکاندا ڕێژەیەکی دیاریکراو لە فەرمانبەران ئامادەو بەشدار بن واتە ژمارەیان زۆر نەبێت تا بوارێکی فراوانتر بڕەخسێت بۆ زیاتر لە یەك تێگەیشتن‌و دەربڕینی راوبۆچوونەکان، ئەمەش یارمەتیدەرێکی باش دەبێت بۆ دیاریکردنی پێداویستییەکانی بەرنامەی کاری راهێنانەکە.

سەرچاوە/ ئەم زنجیرە بابەتە لە کتێبی (الخطوات الذكية) وەرگیراوە، سام و لیل سوسمان. ص/ ٢٦٧-٢٧٧، ٢٨٤- ٢٩٠.

# سەرکردایەتی بۆماوەیە یا دەسکەوتە؟

ن: طارق سویدان
و: دڵشاد محەمەد

بەدرێژایی مێژوو مشتومڕێکی چڕو گفتوگۆیەکی قووڵ هەبووە سەبارەت بەو پرسیارە، هەر کەسەو ڕاوبۆچوونی خۆی هەیە لەو بارەیەوە، جیاوازییەکەش لەمێژینەیەو لە نێو زانایانی کۆن‌و نوێدا بوونی هەیە.. ئەوەتا دکتۆر (بینیز) مامۆستای شارەزاو پسپۆڕ لە بابەتی سەرکردایەتی‌و فەرماندەیی دەڵێت: "سەرکردایەتی کەسایەتی‌و داناییە، ئەو دوو شتەش ناکرێت بەدەست بهێنرێت".

لە کاتێکدا (پیتەر دراکەر) مامۆستاو گەورەی زانایانی ڕۆژئاوایی، دەڵێت: "سەرکردایەتی فێربوونی مومکنەو، فێربوونیشی پێویستە".. لێرەدا دەبێت بپرسین داخۆ ئیسلام هیچ ڕاو هەڵوێستێکی هەیە لەمەڕ ئەو باسەی کە گەورەترین زانایانی کارگێڕیی هاوچەرخ نەیانتوانیوە لەسەری کۆك‌و یەکدەنگ بن؟

ئەگەر ئێمە لە چەمکی سەرکردایەتی وردبینەوەو ڕامێنین، دەبینین لە (٣) شتدا کورت‌و پوخت دەکرێتەوە (زانست، لێهاتوویی، ڕەفتار).. زانست‌و لێهاتوویی، دوو شتی بە دەستهێنراون، بەڵام ئایا ئاکاریش (سلوك) بەدەستهاتووە؟

ڕەنگە ئەم خاڵە هۆکاری جیاوازی زانایان بێت، چونکە هەندێکیان پێیانوایە کە لایەنی مرۆیی‌و تواناداربوون بۆ کارتێکردن لە مرۆڤ ناکرێت بەدەست بهێنرێت، لەبەرئەوەی ئەوە بەهرەیەکی خوداییەو هەوڵ‌و توانستی مرۆیی هیچ ڕۆڵێکی لە گەشەپێدان‌و دەمەزەرد کردن‌و بەرەو پێشبردنیدا نییە... بەڵام هەندێکی تریان سوورن لەسەر ئەوەی بەهرە هیچ پەیوەندییەکی بە سەرکردایەتییەوە نییە..

لە ڕوانگەی ئیسلامەوە (ئاکار) هەم بۆماوەیەو هەم بەدەستهێنراو، ئەوەتا پەیامبەری خودا (د.خ) کاتێك قسە لەگەڵ ئەشەجی عەبدولقەیس دەکات - کە بە نەرمونیانی‌و هێمنی‌و لەسەرخۆییەکەی سەرکردایەتی هۆزی قەیسی دەکرد- پێی دەفەرموویت: {تۆ دوو خەسڵەتت تێدایە خوداو پەیامبەری خودا خۆشیان دەوێت "نەرمونیانی‌و لەسەرخۆیی"،

ئەشەجیش دەپرسێت داخۆ ئەو دوو ڕەفتارە دوو خەسڵەتی بەدەستهێنراون یان خودا خولقاندوویەتی‌و لەسەریان ڕایهێناوە.. پەیامبەریش دەفەرموێت: دوو خەسڵەتن کە خودا تۆی لەسەرخولقاندووە}....

کەواتە کەسانێك هەن بە فیترەت توانای سەرکردایەتییان تێدایە.

لە فەرموودەیەکی تریشدا دەفەرموویت "زانست بە فێربوونەو نەرمونیانیش بەخۆڕاهێنان‌و خۆفێرکردنە"... ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەکرێت ڕەفتار بە دەستبهێنرێت، هەروەك چۆن زانست‌و زانیاری بەدەست دەهێنرێت..

بەکورتی کەسانێکی کەم هەن - بەرێژەی ٢٪- کە سیفەتی سەرکردایەتی‌و پێشەوایەتی تێیاندا زگماکییە، هەروەها کەسانێکی تریش هەن -بە ڕێژەی ٢٪- بەکەڵکی سەرکردایەتی نایەن‌و ناتوانن بەدەستی بهێنن... ئیدی زۆربەی خەڵکی دەتوانن خەسڵەتی فەرماندەیی‌و سەرکردایەتی بەڕێژەی جیاواز بە دەستبهێنن، بەڵام هەرچۆنێکیش بەدەستی بهێنن، ناتوانن وەك ئەو کەسانە بن کە خودا بە زگماکی ئەو خەسڵەتەی تێدا خولقاندوون...

# چۆن کۆبوونەوە کورت و بەرهەمدارەکان دەبەستیت؟

د. محمد احمد عبدالجواد
و: حسین مەحمود هەڵەبجەیی

چۆن گەشە بە بۆچوونەکان دەدەیتو بڕیار وەردەگریت لە کۆبوونەوەدا
لە یادت بێت بڕیاری ئاسانو خێرا لە کۆبوونـەوەدا = ئاسـتەنگو ناڕەحەتی لە کاتی ڕاپەڕاندندا!

بابەتـی یەکخسـتن بابەتێکی گرنگە، پێویسـتە لە چوار لایەنەوە بڕوانینە ئەم کارە
ئەگەرتێمان ڕوانی لە لایەنی:
* هـۆکاری هێـز: ئـەوە ئێمـە لـە ئەنجامی ئەمـەدا بۆچوونەکان لە خۆمان کۆدەکەینەوە، هەروەها سـود وەرگرتن لە توانا لە ڕادەبەدەرەکانی کەسـانی تریش، هەروەها ئەوان هەسـت دەکـەن کە ئێمە دەتوانیـن کاربکەین لـە چوارچێوەیەکدا کـە کۆمان بکاتەوە لەگەڵ کەسـانی تردا، هەروەها یارمەتیمـان دەدات لە کاروباری تریشدا.
ئەگەر تێمان ڕوانی لە لایەنی:
* هـۆکاری لاوازی: ئـەوە ئێمـە لـە حاڵەتـی شکسـتداین لـە مامەڵەکردنمان لەگەڵیـان بـەم شـێوەیە، ئـەوە هەموان دەبنە نەیارمـانو وادەبینین کە بوونمان ترسـە بۆ ئـەوان.... هەروەهـا ئێمە بەو شـێوەیە کارە بە سـودەکان قـۆرخ کەین ئەوانەی کە پێشـکەش قوتابیانی دەکەین، ئەمانەش تانێکن خوازیارم کە لە خۆمانی دووربخەینەوە.

ئەگەر تێمان ڕوانی لە لایەنی:
* فرسـەتی لـە بـارەوە: ئـەوە ئەو کەسـانە ئێمەیان دەوێ، چونکە زۆرینەی یەکیەتیەکەمـان پێـك هێنـاوە، هەمـوو تواناو پێویستییەك لە دەستی ئێمەدایە...
هەروەها ئەم کارە لەگەڵ حەزی بەرپرساندا ڕاسـتەوانەیە لە بەڕێوەبردنـی زانکۆ لە بەشداربوونی زۆرترین ژمارەی قوتابی لە چالاکییە خوێندکارییەکاندا.
ئەگەر تێمان ڕوانی لە لایەنی:
* هەڕەشـە لێکردنەوە: ئەوە خۆمان لـە بـەردەم چەندیـن کێشـەی کەڵەکە بـوودا دەبینینـەوە بۆ خاڵـی کردنەوەی هـۆش لە ڕاپەڕاندنی پلانـی یەکیەتیەکە لەم سـاڵدا... هەروەهـا ناڕەزایی قوتابیان بەرامبـەر پلانەکەمان، ئـەوەش بە هۆی نائاشـکرایی و گۆڕانکاری کردن تیایدا لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر... هەروەها ناچار دەبین پەشـیمان بینەوەو وەڵامی هەندێ بۆچوونیـان بدەینەوە ئەوانەی کە لەگەڵ بەرژەوەندی قوتابیاندا ناگونجێت.
سودی ئەم شیکردنەوەیە:
* وامـان لێـدەکات هۆکارەکانـی هێز زیاد بکەین.
* لـە هۆکارە لاوازەکان بەدووربین بە پێی توانا.
* سـود لـە فرسـەتە لـە بـارەکان وەربگرین.

* خۆمـان لـە زیانـەکان بپارێزیـن، هەروەهـا ئەمە توێژینـەوەی کردەییمان بۆ دەرەخسـێنێت بۆ هەموو ئەگەرەکانو ئەنجامـەکان بـۆ هـەر هەنگاوێـك لـە هەنگاوەکان.

پێکـەوە بـۆ گەیشـتن بـە بڕیارێکی دروست لە کۆبوونەوەکەتدا
* لـە یـادت بێـت کـە بنچینـە لە بابەتەکاندا کە دەخرێتە بەر وتوێژ لە ناو کۆبوونەوەکەدا، پێویستە لیژنە هەبێت یان بەش کە پێشتر هەستابێت بە وتوێژکردن لەسەری لە هەموو لایەنەکانییەوە.
* پێویستە ڕەهەندەکانی ئەو مەسەلەیە دیاری بکرێت کە وتوێژی لەسەر دەکرێت، پێویستە ئامانج لە وتوێژکردنەکە ئاشکرا بێت.
* بەشداربووان لە وتوێژەکاندا ئاراستە بکە، ڕێگا لە بەردەمیاندا ڕۆشـن بکەرەوە بۆ وتوێژ لە سەر خاڵە کاریگەرەکان.
* ئەگەر یەکێك لە ئامادەبووان ڕای خۆی دەربڕیو تۆش بە باشی تێ نەدەگەیشتی... پێویستە هەوڵ بدەیت لە مەبەستەکەی تێ بگەیت... داڕشتنەکەی دووبارە بکەیتەوە بە شێوازی خۆت ئەگەر پێویستی کرد.
* ڕاڕا مەبـە لـە ڕوونکردنـەوەی ئامانجـی چاوپێکەوتنەکـە یـان ئامانجی وتوێژی یەکێ لە خاڵەکان بۆ جارێکی تر، ئەگەر پێویست بوو وابکرێت.

# پێشبینی لە بەڕێوەبردندا

شاخەوان جەمال

مەبەست لە کاری بەڕێوەبردن گەیشتنە بەو ئامانجانەی کە نەخشەیان بۆ دانراوەو لە چوارچێوەی خشتەکاندان، بەهۆی پێشبینیەوەیە کە دەتوانین بگەینە بارودۆخێك کە تیایدا دەتوانین نەخشە بۆ داهاتوو بکێشینو بڕیاری چۆنییەتی کارکردن بدەین، لەبەرئەمەیە کە پێشبینیکردن زۆر پێویستەو یەکێکە لە مەرجەکانی بەڕێوەبەری سەرکەوتوو.

پێشبینیکردن واتە: خەملاندن یان دیاریکردنی ئاستی ئەو چالاکیو گۆڕانکاریانەی کە لە داهاتوودا ڕوودەدەن، ئەویش بە پشتبەستن بە چەند هۆکارێك وەك ئامارەکانو شارەزاییو لێهاتوویی ئەو کەسەی کە هەڵدەستێت بە پێشبینیکردن.

دەبینین دونیای ئەمڕۆ جۆرە ئاڵۆزییەکی پێوەدیارە لەبەرئەمە پێشبینیکردن دەبێت بە بەردەوامی کاری لەسەر بکرێت بە هەر سێ جۆرەکانی پێشبینی ماوە کورتو ماوە مامناوەندو ماوە درێژەوە.

هەروەك چۆن پێشبینیکردن لە بوارەکانی کەشو هەواو بارودۆخی سیاسی باوەو هەوڵی بۆ دەدرێت بەو شێوەیەش پێشبینی بارودۆخی ئابووریو هەڵبەزو دابەزی نرخەکانو هەڵسوکەوتو حەزو ئارەزووی بەکاربەرو کڕیارەکانیش بۆ بەڕێوەبەران بە تایبەت بەڕێوەبەرانی ڕێکخراوە فرۆشیارەکان کارێکی گرنگەو پێویستە بەردەوام کاری بۆ بکرێت.

هەروەها پێشبینیکردنی هەڵسوکەوتی کارمەندان لە فەرمانگەکاندا لە لایەن بەڕێوەبەرانەوە جێی گرنگی پێدانە.

ئەگەر پێشبینی بۆ شتەکان نەکەین لەوانەیە بکەوینە ناو موجازەفەیەك کە نەتوانین بە ئاسانی خۆمانی لێ دەرباز بکەین.

* لە کاتی وتوێژی خاڵێکدا لە خشتەی کارەکاندا، پێویستە ڕوونو ئاشکرا بێت بۆ ئامادەبوانو بزانن چەندە کات دەبات.

* هەر خاڵێك لە خاڵەکانی خشتەی کارەکان بەش بکە کە دەخوازێ لێیەوە بڕیار وەربگیرێت، دابەشی بکە بە سەر نۆ هەنگاودا:

* هەنگاوی یەکەم: بابەتەکە لە هەموو لایەنەکانەوە پێشکەش بکە، دڵنیابە لە بوونی هەموو زانیارییەك بە تەواوی بۆ ئامادەبوان.

* هەنگاوی دووەم: کاتی دیاری کراو بدە بە هەموو ئەندامێك تاوەکو بە تەواوی ڕای خۆی دەرببڕێت بۆ ئەو بابەتە پێشنیار کراوە.

* هەنگاوی سێیەم: هەموو بۆچوونەکان لە بەردەمتا یاداشت بکە لەسەر تەختەی ڕەش بە شێوەیەك لە شوێنێکدا بێت کە ئامادەبووان هەموویان بیبینن.

* هەنگاوی چوارەم: هەندێ لە کات بدە بە بەشداربووان تاوەکو ڕای یەکتر بگۆڕنەوە بە بێ ڕەخنە گرتن لە ڕاوبۆچوون یان بە سوك زانینی ڕای ئەوانی تر.

* هەنگاوی پێنجەم: دڵنیابە لەوەی کە هیچ پێشنیارێکی تر نەماوە... بابەتە پێشنیارکراوەکە، کە پێویستە بڕیاری لە سەر دەربکرێت، بە تەوای ئاشکرا بوو بۆ هەموو بەشداربووان.

* هەنگاوی شەشەم: هەستە بە کرداری دەنگدانو بڕیار وەرگرتن لە ناو کۆبونەوەکەدا.

* هەنگاوی حەوتەم: هەستە بە داڕشتنی بڕیاری کۆتایی، کە بە تەواوی ڕای لە سەر وەرگیراوە، دڵنیابە لە تێگەیشتنی لە لایەنی ئامادەبووانەوە.

* هەنگاوی هەشتەم: ناوی ئەو کەسە یان ئەو لیژنەیە تۆمار بکە کە بەرپرسە لە هەستان بەو کارە، تاوەکو ئاشکرابێتو دیاری کراو بێت.

* هەنگاوی نۆیەم: هەمووان دڵنیا بکە کە بەرەکەتو کار دروستی هەمیشە لە کارێکدایە کە ڕاوێژی لەسەر بکرێت (وأمرهم شورى بينهم).

لە یادت بێت کە:

کاتێ یەکێ لە ئەندامانی کۆبوونەوەکە بۆ گوزارش لە هەندێ لە ڕاستیەکان دەدوێت دەربارەی بابەتی باسکراو تۆ لایەنێکی باسەکە دەگریت... تۆش بابەتەکەی پێ دەبڕیت.

گەشەکردنی بۆچوونەکان پێویستی بە باسکردنی هەموو ڕاستیەکان هەیە دەربارەی بابەتەکە، ڕەخساندنی بوار بۆ ئامادەبووان بۆ گوزارش کردن لە سەر ڕاو بۆچوونیان... بەڵام دوای دڵنیایی لە باسکردنی هەموو ڕاستییەکان.

# چۆن جیاکار دەبیت لەکۆبوونەوەکاندا؟

سەلمان هەڵەبجەیی
زانکۆی صەلاحەدین

سەرەتا پێناسەی کۆبوونەوە دەکەین، پاشان دێینە سەرئەوەی کەچۆن جیاکار دەبیت کاتێك دەتەوێت بەشداربیت لە چالاکییەکانی کۆبوونەوەیەك.

کۆبونەوە بریتییە لە بۆنەیەك تیایدا کۆمەڵە خەڵکێك لەیەك جێگادا کۆدەبنەوە بۆ بەشداریکردنیان لەگەڵ یەکتر لە بیروڕاو ئەزمونەکان بۆ گەیشتن بەئامانجێك، بێگومان ئەمەش بەپێی ژمارەی ئامادەبووان دەگۆڕێت، پێك هاتەیان، ڕێکخستنیان.... مەبەستی کۆبوونەوەیان، بەڵام هەموو بەشدار دەبن لەسەر ئەوەی کە بۆ مەبەستێکی دیاریکراو هاتوون، پەیوەندییان بە یەکترەوە دەبێت بە شێوەیەك لەشێوەکان هەروەها سەرچاوەیان یەك سەرۆکە ئەویش سەرۆکی کۆبوونەوەکەیە.

ئێستا ئەگەر تۆ بەڕێوەبەرێك یان بەرپرسێك بیت لە ئۆرگانێکی حیزبی، دامەزراوە ئابورییەکان، دامودەزگا حکومییەکان.... کاتێك بانگهێشت دەکرێیت بۆ بەشداری کردن لە کۆبوونەوەیەك، بتەوێت جیاکاربیت پرسیارێکی هەمیشەیی هەیە کە پێویست دەکات لە خۆتی بپرسیت، ئەویش ئەوەیە بپرسیت کە ئایا ئەم کۆبوونەوەیە پێویست بە ئامادەبوونی من دەکات؟

وەڵامی ئەو پرسیارە بدەرەوە بەشێوەیەکی بابەتیانە، هەڵوێستێکی راستو دروستت لەگەڵ خۆت هەبێ، ئێمەش هاریکاریت دەکەین لە وەڵامدانەوەت بەم دە پرسیارە:

١- ئایا تواناو لێهاتوویت، بیروڕات کارێکی بنچینەییە بۆ سەرکەوتنی ئەم کۆبونەوەیە؟

٢- ئایا بڕیارەکانی ئەم کۆبونەوەیە راستەوخۆ کاردەکاتە سەر تۆو هاوڕێکانت، هەروەها بەرپرسیاریت لەکارەکانت؟

٣- ئایا پێویستیت بە خۆئامادەکردن هەیە بۆئەوەی ببیتە پێشەنگ بۆ هەڤاڵەکانت لە کۆبونەوەکەدا؟

٤- ئایا ئامادەبوونت هەر لەبەر ئەوەیە کە تۆ راهاتووی بە ئامادەبوونی ئەم کۆبونەوانە بەپێی نازناوو پێگەو نەریت؟

٥- ئایا لەو کۆبونەوەیەدا بەرپرسە گەورەکانو سەرۆکەکانت ئامادە دەبن، دەتەوێت بە ئامادەبوونت پشتگیریان بکەیت؟

٦- ئایا لێرەدا بابەتێك هەیە کە بتەوێت گفتوگۆی لەسەر بکەیت بە تایبەتی، یان نارازی بیت لێی، یان بەجێی بهێڵیت بۆ کۆبوونەوەکە؟

٧- ئایا لەکۆبونەوەکەدا گفتوگۆ لەسەر بابەتە زۆر گرنگەکان دەکرێت بەجۆرێك ناکرێت جێگرێك لەجیاتیت ئامادەبێت؟

٨- ئایا لێرەدا ئەو بابەتانە لە کۆبونەوەدا نەبێت بڕیاری لەسەر وەرناگیرێت؟

٩- ئایا وا دەڕوانیتە ئەم کۆبوونەوەیە کە شتی لێوە فێربیت؟

١٠- ئایا لەسەر بڕیاری سەرۆکەکەت ئامادەی ئەم کۆبونەوەیە دەبیت؟

دە پرسیاری بابەتی دروستن ئەوە دیاری دەکات کە پێویستە ئامادەی ئەم کۆبونەوەیە بیت یان نا؟ بۆیە ئەگەر وەڵامەکەت لەسەر پرسیارەکان لەنیوە کەمتر بە بەڵێ بوو، زۆر بە دڵنیاییەوە پێوسیت بە ئامادەبوونت ناکات. ئەگەر وەڵامەکەت بە بەڵێ بوو لەسەر حەوت پرسیار، ئەوا پێویست بە ئامادەبوونت دەکات، بەڵام لە هەندێ بۆنەی دیاریکراودا، ئەگەر وەڵامەکانت بە بەڵێ لەسەر حەوت پرسیار زیاتربوو ئەوا پێوسیتە ئامادەبیت.

ئەگەر وەڵامەکەت بە بەڵێ بوو لەسەر (٥-٧) پرسیار ئەوا پێویست بە هەڵوێستەیەك دەکات لەگەڵ خودی خۆت، جارێکی تر هاوسەنگییەك بکە لەنێوان نوێیو بابەتی، رەنگە ترسی سەرۆکەکەت هەبێتو ئامادە بیت، بۆ جارێکی تر پرسیار لە خۆت بکە ئایا پێویست بە ئامادەبوونت دەکات یان نا؟ ئەگەر وەڵامەکانت لەسەر پرسیارەکان بە ئامادەنەبوون بوو، ترسی سەرۆکت نەبێو دەکرێت پێی بسەلمێنی کە ئامادەبوونت هیچ سوودێکی نابێت.

بەردەوام ئەوە لەبیر مەکە، کە داواکردنی سەرۆکەکەت بۆ ئامادەبوونت لە کۆبونەوە، ئەوە ناگەیەنێت کە پێویست بە ئامادەبوونت دەکات.

سەرچاوە:(بەڕێوەبردنی کۆبونەوەکان).

# بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی
# و
# بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی

و: ئالانی

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: لە جەژنەکاندا پیرۆزباییت ئاراستە دەکات.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: لە جەژنەکاندا داوای کارکردنت لێ دەکات.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: سڵاوت لێ دەکات و پێت دەڵێت: بەیانیت باش.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: پێت دەڵێت: (هاتیت بۆ سەر کار؟)

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: هەوڵ دەدات بۆ پێشخستنی کۆمپانیاکەی.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: هەوڵ دەدات بۆ پێشخستنی خۆی.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: سەرەتای قسەکانی بەم شێوەیە دەست پێ دەکات: (من لەو بڕوایەدام...)

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: سەرەتای قسەکانی بەم شێوەیە دەست پێ دەکات: (من بڕیارم داوە...)

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: بە پێی دڵسۆزیت لە کارکردندا پلەت بەرز دەکاتەوە.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: بەپێی ماستاو کردنت، پلەت بەرز دەکاتەوە.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: نەخشەیەکت بۆ دادەنێت کە لەگەڵ تواناکانتدا بگونجێت.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: نەخشەیەکت بۆ دادەنێت کە لەگەڵ خەیاڵی خۆیدا بگونجێ.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: متمانەت پێ دەکات.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: متمانە بە خۆی دەکات.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: ڕێگەت پێ دەدا کە سکاڵا بکەیت.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: ڕێگەت پێ دەدات کە وەسفی بکەیت.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: ئەگەر داوای دەست لە کارکێشانەوەت کرد، هەوڵ دەدات پەشیمانت بکاتەوە، بۆ ئەو مەبەستە گفتوگۆت لەگەڵدا دەکات.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: هانت دەدات بۆئەوەی دەست لە کاربکێشیتەوە.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: بە پێی بارودۆخی دەروونیت مامەڵەت لەگەڵدا دەکات.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: بەپێی میزاجی خۆی مامەڵەت لەگەڵدا دەکات.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: بە باشی دەزانێت لە بەردەم هاوکارو کەسانی دیکە ستایشت بکات.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: بە چاکی دەزانێت کە تۆ لای کەسانی دی ستایشی بکەیت.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: ڕۆژێکی شیرینو... ڕۆژێکی تاڵ...

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: ڕۆژێ تاڵو... ڕۆژێکی تاڵتر...

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: چاودێریت دەکات.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: سیخوڕیت بە سەرەوە دەکات.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: پەرە بە بیرۆکەکانت دەدات، بە ناوی تۆوە بەرزی دەکاتەوە بۆ سەرو خۆی.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: بیرۆکەکانت دەدزێو بە ناوی خۆیەوە بۆ سەرو خۆی بەرزی دەکاتەوە.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: ئایندەی گەشت بەڕێوەیە.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: ئایندەی تۆ لە دەستی خۆیدا دەبینێت.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: ئەگەر ناکۆکییەکت لەگەڵیدا هەبوو، دان بەخۆیدا دەگرێت.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: ئەگەر بیرت لە ناکۆکی کردەوە لە گەڵیدا، دەست لە بینەقاقات گیر دەکات.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: چاوەڕێ دەکات گوێبیستی بۆچوونەکانت بێت، سەبارەت بە پێشخستنی کار.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: چاوەڕێ دەکات گوێبیستی بۆچوونەکانت بێت، سەبارەت بە خۆی.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: بیرۆکەکانت دەوروژێنێت.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: ئەعصابت دەوروژێنێت.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: بە دەنگ لەگەڵت دەدوێ.

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: بە زەبر لەگەڵت دەدوێ.

بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی: دەیەوێت کە تۆ بڵێیت: (من پێشنیار دەکەم...)

بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی: دەیەوێت کە تۆ بڵێیت: (من لایەنگیری بۆچوونەکانت دەکەم).

سەرچاوە/ ئینتەرنێت.

# جوانی زانستو جوانی ڕەوشت

تاوس ڕازی نەبوو بچێتە قوتابخانە بخوێنێتو بە لەخۆباییەوە بە دایکی گوت: زانست سوودی چییە؟

من دروستکراوێکی زۆر جوانم، پەڕوباڵم ڕەنگاوڕەنگە بە قەشەنگترینی ڕەنگەکان، کلکێکی درێژم هەیەو کلکی باڵندەکانی تر لە هی من جوانتر نییە. دایکە تەماشاکە کاتێك پەڕەکانم دەکەمەوە چەند دیمەنێکی سەرنجڕاکێشم دەبێت. کلکی ئەفسوناویم وەك چەترێکی ڕەنگاوڕەنگی بێ وێنەیە، پەڕوباڵی کردەوەو ئینجا بەردەوام بوو لە قسەکردن لەگەڵ دایکیداو گوتی: سەیری ڕۆیشتنم بکە، ئایا هیچ دروستکراوێکی تر ئەم تایبەتمەندییانەی منی هەیە؟

من ئەمەم بەسە چ پێویستیم بە زانست هەیە!

دایکی پێی گوت: ڕۆڵەی شیرینم بە هەڵەدا مەچۆ، زۆر هەڵەیە ئەوەی تەنها پشت بە جوانییەکەی یان جوانی جلوبەرگو ڕواڵەتی ببەستێت، جوانی لەگەڵ تێپەڕبوونی کات نامێنێت، ڕواڵەتیش دوای ماوەیەك ڕەونەقو ڕەنگەکانی لە دەست دەدات، ڕۆیشتنی بەفیزو لە خۆبایی زیان بە خاوەنەکەی دەگەیەنێتو هاوڕێیانی لێ دووردەخاتەوە، ڕۆڵەکەم چی لەوە جوانترە کە جوانی لەگەڵ زانستو ڕەوشتو بێ فیزییەوە بێت. زانست خاوەنەکەی بەرزدەکاتەوەو وڵات بنیات دەنێت. بێ فیزییش وا دەکات کە لە لای خەڵکی خۆشەویست بیت. بە ڕەوشتیش ڕێز لە ئەوانی تر دەگریتو ناچاریان دەکەیت ڕێزت بگرن. تاوسە بچکۆلەکە زۆر بە باشی گوێی لە قسەو ئامۆژگارییەکانی دایکی ڕاگرتبوو. ئەوەبوو لە ڕۆژی دواتردا، تاوس لە کورسی پێشەوەی پۆلدا دانیشتبوو و وانەکانی دەخوێند.

# تۆپی

منداڵان ئەم یارییە لە نێوان دوو تیپی پێنج یاریزانی ئەنجام دەدرێت کە هەریەکێکیان کیبڕکێ دەکات لەسەر بەدەستهێنانی زۆرترین ژمارەی خاڵەکان. تۆمارکردنی گۆڵی ئەم جۆرە یارییە بریتییە لە تۆپ خستنە ناو تۆڕێکی بچکۆلەی شێوە سەبەتە، کە بە بەرزی سێ مەتر لە ستوونێکەوە بەستراوە. یاریزانەکە بەشێوەیەك تۆپەکە بەرەو سەبەتەکە دەبات کە لەگەڵ ڕۆیشتن بەرەو لای سەبەتەی تیپی بەرامبەر تۆپەکە دەکێشێت بە زەویدا تاکو دووبارە بگەڕێتەوە ناو دەستی، پاشان بۆ یەکێك لە ئەندامانی

## سەبەتە

تیپەکەی دەیهاوێژێت. ئەگەر یاریزان توانی لە لێدانێکی سەربەستدا گۆڵ بکات واتە تۆپەکە بخاتە ناو سەبەتەی تیپی بەرامبەر ئەوا تەنها خاڵێك بۆ تیپەکە دەنووسرێت، بەڵام گۆڵ کردن لەناو ناوچەی سەبەتەکە دوو خاڵەو هەروەها گۆڵ کردن لە دەرەوەی ناوچەکە سێ خاڵە. درێژی یاریگەی تۆپی سەبەتە ٢٤-٢٨ مەترەو پانییەکەشی ١٣-١٥ مەترە. تۆپی ئەم یارییە لە پێست یان ماددەیەکی جیڕ دروست دەکرێت، ئینجا تاقی دەکرێتەوەو کێشەکەی ٦٠٠-٦٥٠ گرام دەبێت.

# منداڵ و بەکارهێنانی مۆبایل

منداڵان ئەمڕۆ بەکارهێنانی مۆبایل بۆتە بەشێکی کاریگەر لە ژیانی ڕۆژانەماندا، لەبەرئەوە لە بارەی چۆنیەتی سوود لێوەرگرتنو بەکارهێنانی بە ئێوە دەڵێم:

* من تەنها لە کاتی زۆر پێویست نەبێت مۆبایل بە کارناهێنم، چونکە زۆرێك لە شارەزایان ئامۆژگاری ئێمەی منداڵانی خوار تەمەنی ١٢ساڵی دەکەن کە مۆبایل بەکارنەهێنین، تەنها لە کاتی پێویستدا نەبێتو دەبێت بۆ ماوەیەکی کەم بێت، ئەمەش لەبەر ئەو تیشکەی لە شەپۆلەکانییەوە دەردەچێتو کاریگەری خراپی دەبێت بۆ سەر خانەکانی مێشکمان کە لە قۆناغی گەشەکردندان.

* کاتێك تەلەفۆن بۆ یەکێك دەکەم سەرەتا سڵاوی لێدەکەمو بەڕێزەوە ناوی دەهێنم، ئینجا بە نەرمیو هێمنی قسەدەکەمو دەنگم بەرزناکەمەوە، بە هەمان شێوە لە کاتی وەڵامدانەوەدا بە ڕێزەوە وەڵامی سڵاوی قسەکەر دەدەمەوەو بە ئارامیو هێواشی لەگەڵیدا دەدوێم.

* ئەگەر لەگەڵ هاوڕێیەکانمدا بووم بۆ قسەکردن یاخود وەڵامدانەوەی مۆبایل، مۆڵەتیان لێ وەردەگرم.

* من لە کاتی نەگونجاودا بۆ نموونە وەك کاتی نانخواردن یان کاتەکانی پشوودانو درەنگی شەو مۆبایل بەکارناهێنم.

* کاتێك یەکێك لە لامدا خەریکی قسەو پەیوەندی کردن بێت بە مۆبایل من گوێ لە قسەکانی ڕاناگرم.

# 22 یاسای جێگیر لە بازاڕسازیدا

هاژە شێروانی

بەشی دووەم

هەروەك لە ژمارەی پێشوو ئاماژەمان بە حەوت یاسای جێگیر کرد لە بازاڕسازییدا کە ئەوانیش بریتی بوون لە: یاساکانی (پێشەنگیو پێشەوایەتی، پۆلێن کردن، زەین، پێشبینییەکان، تیشك خستنە سەر، تاکڕەوی، یاسای پایەکانی پلیکانە)، لە ژمارەی ئەمجارەی بڕیارو لە زنجیرەی دووەمدا لەگەڵمان بن بۆ حەوت یاسای دیکە ئەوانیش (یاسای دووانەیی، دژ یەك یا سەرپێچی کردن، دابەشکردن، ماوەی درێژخایەن، درێژە پێدانو قوربانیدان، یاسای سیفەتەکان)ن، بفەرموون:

٨- یاسای دووانەیی: (بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، بازاڕ دەبێتە پێشبڕکێیەك لە نێوان تەنها دوو (نیشانە) یا (دروشم):

* بۆ نموونە (بیبسیو کۆکاکۆلا، تایدو ئاریال، کانونو نیکون، سونیو نینتیندو،...... هتد).

* هەموو یەك لایکردنەوەیەك لە نێوان دوو یاریزان دەبێت، یەکەمو لە پێشترو هاتووی نوێ.

* لە پیشەسازی تێربوو و تەواو و جێگیر بوو، پلەی سێیەم ئاستێکی ئاستەمە.

* کڕیارەکان حەز بە بەراووردکردنی نێوان دوو هەڵبژاردە دەکەن، کە هەڵبژاردنی زۆرتر گوزارشت دەکات لە کۆششێکی زۆر لە لایەنی دەروونیو زەینی.

* لە کاتی گەشەسەندنو پێگەیشتنی بازاڕو جێگیربوونی لە ئاستی یەکەمو دووەم لە زەینی خەڵکدا، ئەم خەڵکانە ڕێگا نادەن بە ئاڵوگۆڕی مەڵبەندەکان، یەکەم هەر یەکەمو دووەمیش دووەم.

ئەگەر هاتوو ئەم یاسایەت نەدۆزییەوە جێبەجێ بکرێت، بە بێگومان ناهاوسەنگی مەرجەکانی ڕکابەری کردنی سەربەست بەدی دەکرێت لەگەڵ بوونی داهێنان، یا پێ نەگەیشتنی بازاڕو کەمی ئاستی هۆشیاری لە لای بەکارهێنەرەکان.

٩- یاسای دژیەك/ سەرپێچی کردن: (ئەگەر هاتوو بە دوای پلەی دووەمدا دەگەڕێیت، لێرەدا ستراتیژییەتی تۆ پێچەوانەی ئەوەیە کە پێشەنگی بازاڕ دەیکات):

* تاوەکو پێشەنگی یەکەم بازاڕ بەهێز بێت، ئاماژەیەکە بە بوونی دەرفەتێك بۆ ئەو کەسەی لە پلەی دووەمدا دێت، چونکە لە هێزدا خاڵە لاوازەکان دەردەکەون.

*ناوجەرگەیسەرکەوتنیسەرکردایەتی بە دیاربخە، ستراتیژیەتەکەت دیزاین بکە بۆ ئەوەی لە دژی خاڵە بەهێزەکانیان بووەستیت، جیاواز بەو باشتر مەبە.

* بەرهەمەکانت بنێرە بازاڕ وەکو ئەوەی کە بەرهەمی ئەلتەرناتیف بن بۆ

یەکەم جار.

* ئەو (مارکە)یەی کە یەکەمە لە دەستە بەرکردنی ئەم بنەمایانە، هەمیشە دەتوانێت کە ڕکابەرانی بەوە بچوێنێت کە لاسایی کەرەوەن نەك زیاتر.

بە کورتی : لاسایی پێشەوای بازاڕ مەکەرەوە، بەڵکو بەرهەمەکانت بخەرە بازاڕ وەك ئەوەی کە ئەلتەرناتیڤێکی باشتری لەو، لە ساڵی (١٩٩٤)دا کۆمپانیای نینتندو بەرهەمەکانی ئاراستەی هەرزەکاران کرد لە ئامێرو یارییەکانی ناوماڵدا، کاتێك کە (سۆنی) هاتە ناو پێشبڕکێیەکەو پەیامەکەی ئاراستەی گەنجانو لاوان کرد، ئەم چینە کەرتی بازاڕی بە تەواوی داگیرکرد.

١٠- یاسای دابەشکردن: (بە تێپەڕینی کات، هەر پۆلێنێك دابەش دەبێتە سەر دوو پۆلێنی تر یا زیاتر):

* لە کاتی داهێنانی ئۆتۆمبێل تەنها لە یەك پۆلێن پێك هاتبوو، کەچی ئەمڕۆ ئۆتۆمبێلی خێزان، وەرزشی، چوار کەسی، زۆربەرز (ئەلفان و فۆرمێلا)و لە هەر پۆلێنێك دەبینین پێشەوایەك یا سەرکردەیەك هەیە.

* کاتێك کە بیبسیو کۆکا کۆلا تاکە خواردنەوەی گازی بوون، کەچی ئێستا خواردنەوەکانی وەك (دایت)، خواردنەوە وزە بەخشەکان، ئاوی کانزایو شیرەمەنی بە چەوری تەواو و نیوە چەوریو بە بێ چەوری.... هتد، بەر چاو دەکەون.

* چۆن کۆمپیوتەر لە سەرەتادا (Main Frame) بوو لە دوایدا بوو بە وێستگەی کارو خزمەت، کەسی، ئێستاش لاپتۆپ.

* گەورەترین هەڵە کە کۆمپانیاکان تێی دەکەون ئەوەیە کە ناوێکی بازرگانی سەرکەوتوو بۆ بەرهەمەکانیان دادەنێن، لە دوایدا تێکەڵ بە پۆلێنێکی تری نوێی دەکەن وەك کاتێك کە (فۆلکس فاگن) پێشەوای کەرتی ئۆتۆمبێلە بچووکەکان بوو لە ساڵانی شەستەکانو حەفتاکانو کاتێك کە ویستی ئۆتۆمبێلی گەورەو بەرزتر بداتە هەمان بازارو لە ژێر هەمان ناودا، لە هەموو ئاراستەکان هەرەسی هێنا، هەر بۆیە کڕیاری ئۆتۆمبێلە بچووکەکان هەڵسان بە گەڕان بە دوای ئەلتەرناتیڤێکی تر، لە زەینی کەسانی تریشدا وا مایەوە کە فولکس فاجن هاو واتای ئۆتۆمبێلە سادەو بچووکەکانە).

* خەڵك وایان پێ باشترە کە بەرهەمو خزمەتەکانیان لە کۆمپانیا جیاوازەکان بکڕن، بە مەزەندەی ئەوەی کە پێشەوایەتی بازاڕی ئەم پۆڵێنە چۆنە کە ئەم کۆمپانیایە کاری تیادا دەکات.

١١- یاسای ماوەی درێژخایەن: (شوێنەواری کۆششە بازاڕسازییەکان کەلەکە دەبن لەگەڵ کاتدا، پێویستی بە ماوەیەکی زەمەنی درێژ دەبێت تا شوێنەوارە ڕاستییەکەی دەربخات):

* هەمیشە وا دەبێت کە دەرەنجامە درێژخایەنەکان بە تەواوی پێچەوانەی دەرەنجامە کورت خایەنەکانن.

* لێکۆڵینەوەکان دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کە داشکانی نرخەکان (وەکو لە کۆتایی وەرزەکان دەبینین) کڕیارەکانی بە ئاگا هێنا کە بە نرخی ئاسایی نەکڕن (کە قازانج زۆرە) بەڵکو ڕەچاوی وەرزی داشکان بکەن (کە تیایدا قازانجەکان زۆر زۆرن).

* پێشکەش کردنی بانگەشەکان، لە ماوەیەکی کورت خایەندا، دەبێتە هۆی تێك شکاندنت لە ماوەیەکی درێژ خایەندا، چونکە پێویستە کە بەردەوام ئەم بانگەشانە پێشکەش بکرێت تاوەکو فرۆشتن بە یەك ئاستدا بڕوات.

* ئەم یاسایە ڕاستییەك دەخاتە ڕوو کە زۆرێك لە شتە شاراوەکان دەخاتە ڕوو ئەویش ئەوەیە کە دەرەنجامی درێژخایەن بۆ کۆششی بازاڕسازی (کە پێویستی بە ماوەیەکی زۆر هەیە تا دەردەکەوێت) لە وانەیە نێگەتیڤ بێت، لە هەمان کاتدا دەرەنجامی کورت خایەنیش لە وانەیە پۆزەتیڤ بێت.

١٢- یاسای درێژە پێدان: (پاڵنەرێکی زۆر هەیە بەرەو دروست کردنی بەرهەمی نوێ کە سوودمەند دەبێت لە سەرکەوتنی ئەم بەرهەمەی ئێستا):

* ناوی بەرهەمێکی سەرکەوتووت مەبەو بیخەیتە سەر بەرهەمێکی ترت کە نادیار بێت.

* بە هێزەوە تیشك بخە سەر یەك بەرهەم کە قازانجێکی زۆر دەستەبەر دەکات.

* قازانجەکەت زیاد مەکە لە ڕێگای سەربارکردنی تر بە بەرهەمێك کە زەرەر مەندیت تیایدا.

* کاتێك کە هەوڵ دەدەیت هەموو شتێك بۆ خەڵك دابین بکەیت، کۆتاییەکەت لە دەریایەك دێت کە پڕ بێت لە گرفت، چونکە دابین کردنی هەموو شتێك یەکسانە بە دابین نەکردنی هیچ شتێك.

هەر بۆ نموونە دەبینین کە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت لە مێژووی بڵاوکردنەوەی پەرتووکەکەی ساڵی (١٩٩٣) بەرهەم گەلێکی پێشکەش کرد وەك (مایکرۆسۆفت ویندۆز، مایکرۆسۆفت ۆرد، ئێکسڵ،... هتد)، کە ئەو کات پێشبینی سەرکەوتنو سەرنەکەوتنیان بۆ دەکرد، بەڵێ مایکرۆسۆفت تا ئێستاش بەردەوامە، بەڵام دەبێ تێبینی ئەوە بکەین کە لە بانگەشە کردن وەستا بۆ ناوەکەیو تیشکی خستە سەر بانگەشەکردن بۆ (سیستەمی ویندۆزییەکەی)و ڤێرژنی ئۆفیسەکانیو کەمکردنەوەی لە ناوی ئەو بەرهەمانەی کە بانگەشەی بۆ دەکات هەر بۆیە دەبینین کە مایکرۆسۆفت توانی چوار دەوری ئەو یاسایە بدات وەك خۆی بۆ هەمیشە.

١٣- یاسای قوربانیدان: (پێویستە قوربانی بە شتێك بدەیت تا شتێکت بێتە دەست):

لێرەدا سێ شت هەیە کە قوربانی پێ دەدەیت:

**١- ژمارەی بەرهەمەکانت: بۆ ئەوەی سەربکەویت، پێویستە لە سەرت کە ژمارەی ئەو بەرهەمانە کەم بکەیتەوە کە زەرەرمەندنو هیچ پێوەرێکی پۆزەتیڤ پێ نادەن لە سەر توانای زیادکردنی قازانج لە داهاتوودا.**

٢- بازاڕی بە ئامانجی کراو.

**٣- هەڵبژاردنێکی جێگیر: باشترین ڕێگا بۆ پاراستنی پێگەیەکی جێگیر لە بازاڕدا بریتییە لە گۆڕینی ئەو پێگەیە، تاوەکو دەگەین بە باشترین دەرەنجام.**

هەوڵ مەدە پەیڕەوی هەموو لادانەکانی بازاڕ بکەیت، چونکە کۆتاییەکەت بە لادان لە ڕێگای ڕاست دێت، هەندێك جار وا پێویست دەکات کە زۆر پەیماننامەی قازانجدار ڕەت بکەیتەوە لە پێناو تیشك خستنە سەر بەرهەمێکتو پەرەپێدانو باشتر کردنی، قبوولکردنی هەبوو، ئەو داواکارییانەی کە پێشکەش کراون کاریگەری نێگەتیڤی دەبێت لە سەر کوالێتی ئەوەی کە دەیفرۆشین، وەکو سەرقاڵ بوونت بە فرۆشتنی پرۆگرامێکی دیاریکراو، وادەکات کە لە پەرەپێدانی بووەستیت یان فەرامۆشی بکەیتو چارەسەری گرفتەکان نەکەیت.

١٤- یاسای سیفەتەکان: (بۆ هەر سیفەتێك، سیفەتێکی دژو کاریگەر هەیە بۆی):

* پێویستە کە بیرۆکەیەك یا سیفەتێکی تایبەت بە خۆت هەبێت، تا کۆششت بۆی بخەیتە گەڕ.

* دەستبەسەر سیفەتێکدا بگرەو بە هێزەوە بانگەشە بۆ بەهاکەی بکە، بەمەش فرۆشتنت زیاد دەبێت.

* ئەگەر کۆمپانیا دەستی بەسەر دروشمێکدا گرت، ئەم دروشمەش سیفەتێك بوو بۆ بەرهەمەکانی، لێرەدا سیفەتێکی تر دەدۆزێتەوە کە هاوتای هێزی ڕکابەرانەو کۆششی بازاڕسازییەکەت بۆ ئەوەیە تاوەکو لە کاریگەری یەکەمەکەیان کەم بکەیتەوە.

# ئاكیو موریتا «١٩٢١- ١٩٩٩»

## دامەزرێنەری كۆمپانیای سۆنی

ن: بینش مسعود
و: شەهاب مصلح عەبدوڵڵا

ئاكیو موریتا(AKIO MORITA) لە ساڵی ١٩٢١ لە شاری ناگویای ژاپۆن لە بنەماڵەیەكی ناسراو و دەوڵەمەند لە دایك بووە، لەگەڵ ئەوەی باوكی چاوەڕوان بوو كوڕەكەی ڕێگای ئەو بگرێتەبەرو ناوەندی پیشەسازی ساردەمەنی ئەو بەڕێوەبەرێت، ئاكیو هەر لە منداڵییەوە خولیای كەرەستەی كارەبایی بوو، دەیویست بزانێ چۆن كار دەكات، خەونی ئاكیو سازكردنی گرامافۆنی كارەبایی بوو، هەر بەم هۆیە بەشی فیزیای زانكۆی ئوزاكای هەڵبژارد، دوای تەواو كردنی زانكۆ لە جەنگی دووەمی جیهانی وەك پلەداری هێزی دەریایی لە ناوەندی تەكنەلۆژیای هێزی دەریایی دەستی بەكار كردو بەشدار بوو لە تەواو كردنی ئامێری دۆزینەوەی گەرماو كەرەستەی نیشانەگیری لە شەودا، لەوێ لەگەڵ ئەندازیارێكی زیرەك بە ناوی ماسارو ئیبوكا (masaru ibuka) ئاشنا بوو. ئیبوكا لە داهێناندا دەگمەن بوو، لەو كاتەدا كۆمپانیایەكی بە ناوی "كەرەستەی وردبینی ژاپۆن" دامەزراندو ئەمپری فایەرێكی بەهێزی دروست كردبوو كە دەیتوانی ئالۆزی موگناتیسی لە قووڵایی ئاو بۆ ژێر دەریاییەكانی ژاپۆن هەژمار بكات. دوای بۆمبارانی ناوەكی ژاپۆن لە ساڵی ١٩٤٥و تەواو بوون لە شەڕ، موریتا گەڕایەوە شاری خۆی. موریتا لەگەڵ (٧) فەرمانبەر لە بینایەكی چۆڵو نیوە وێران لە تۆكیۆ كۆمپانیایەكی نوێی دامەزراند. موریتا دوای ماوەیەكی كورت بۆ وانەوتنەوە ڕۆیشتە تۆكیۆو لەوێ ئاگادار بووەوە كە دۆستو هاوكاری ئیبوكا زنجیرە وتارێكی لە بابەت كەرەستەی كارەبایی لە ڕۆژنامەی بە ناوبانگی ژاپۆنی «ئاساهی» دەنووسێتو كۆمپانیایەكی دامەزراندووە. موریتا سەردانی دۆستەكەی كردو بڕیاریدا بە شێوەی نیوە كاتو دوای ماوەیەكی كورت تەواو كاتو لەگەڵی كار بكات، بە هاوبیری یەكتر كۆمپانیایەكی نوێیان دامەزراند. ئیبوكای ٣٨ ساڵەو موریتای ٢٥ ساڵە لە ساڵی ١٩٤٦ بە سەرمایەی ٥٠٠ دۆلار (١٩٠٠٠ ین) «كۆمپانیای ئەندازیاری گەیاندنی تۆكیۆ»یان دامەزراند. شوێنی كاری كۆمپانیاكە نهۆمی سێهەمی بینایەكی نیوە وێران لە گەڕەكێكی وێران بوو، بەم شێوەیە بەردی بناغەی كۆمپانیای مەزنی سۆنی بە هەوڵی دوو مرۆڤی ماندوونەناس بە چاككردنەوەی ڕادیۆ دانرا. ١٢ ساڵ دواتر دوای بەدەست هێنانی سەركەوتن لە دوای سەركەوتن لە كار كردنی لەسەر كەرەستەی كارەباییو خستنەڕووی كاڵای دەنگیو ڕەنگی وەك پلاولێنەری كارەبایی، ڤۆڵت میتر، سەرینی كارەباییو تۆماركەرو ڕادیۆو تەلەڤزیۆنو ڤیدیۆو لە دواییدا ناوی كۆمپانیاكەیان بۆ سۆنی گۆڕی. موریتا لە ساڵی ١٩٥٣ یەكەم گەشتی بۆ ئەمریكاو ئەوروپا كردو كەمێك دواتر بە بیرۆكەی هەناردنی بەرهەمەكانی سۆنی بۆ دەرەوەی سنوری ژاپۆن بە تایبەت ئەمریكا لەگەڵ بنەماڵەكەی گەشتی ئەمریكای كردو لە ساڵی ١٩٦٠ كۆمپانیای سۆنی ئەمریكای دامەزراند. یەكەم ڕادیۆی ترانزیستۆری جیهان (TR-٥٥) لە ساڵی ١٩٥٦ لە لایەن سۆنییەوە دروست كراو ساڵی دواتر بچوكترین ڕادیۆی ترانزیستۆری گیرفانی جیهان بە قەبارەی ١١٢ × ٧١ × ٣٢ mmو نرخی ١٣٨٠٠ ین خرایە ڕوو. یەكەم تیڤی ترانزیستۆری مۆدێل ٨ ئینچی (tv٨-٣٠١) لە ساڵی ١٩٥٦و بچوكترینو سووكترین تیڤی (TV٥-٣٠٣)لە ساڵی ١٩٦٢و لە ئەنجامدا تیڤی ڕەنگاوڕەنگی "كروماترون" لە ساڵی ١٩٦٤و "ترینیترون" لە ساڵی ١٩٦٨ ساز كراو خرایە بەردەست بەكاربەران. هەژماردنی بەرهەمەكانی سۆنی كە لە سەرەتاوە تا ئێستا خستوویەتە بەردەم مرۆڤایەتی زۆر زەحمەتە بزانرێتو تەنیا دەتوانین بێجگە لەوانەی باسمان كرد ڤیدیۆ، دیسك، فلۆپی دیسك، شریتی ڤیدیۆی بتاماكس، تیڤی دەستی بچووك، واكمەن، كامێرای ڤیدیۆی ٨ مەو كامێرای وێنە گرتنو دەیان شتی دیكە باس بكەین. لە ماوەی هاوكاری ئەو دوو دۆستە بە وەفایە، ئیبوكا توانای خۆی بۆ توێژینەوە لەسەر تەكنەلۆژیاو پەرەپێدانی بەرهەمەكان خستەگەڕو موریتا توانای خۆی لە پەرەپێدانی سۆنی لە شوێنە جۆراوجۆرەكانی جیهانو بە جیهانی كردنی سۆنیو گرنگیدان بە بابەتی داراییو پەرەپێدانی هێزی مرۆییو چوونە ناو دونیای سۆفت وێرد بەكارهێنا. موریتا پێشڕەوی بیرۆكەی بە جیهانی كردنی كۆمپانیاكانەو بۆ پەرەپێدانی سۆنی بۆ زۆربەی وڵاتەكان گەشتی كرد. موریتا ناسراوترین ژاپۆنی لە ئەمریكایە كە زۆر خەڵاتی بردۆتەوە. توانایی موریتا لە خوێندنەوەو ناسینی دوو كەلتووری ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتو ئاوێتە كردنیان سەرسوڕهێنەر بوو. موریتا لە ساڵی ١٩٥٩ جێگری سەرۆكی سۆنی بوو، لە ساڵی ١٩٧١ بە سەرۆكایەتی سۆنی گەیشتو تا ساڵی ١٩٩٤ كە وەك سەرۆكی شانازی سۆنی خانەنشین كرا لە پۆستەكانی سەرۆكایەتی، بەڕێوەبەری جێبەجێ كردنو سەرۆكی لێژنەی بەڕێوەبەری خزمەتی كرد. ئیبوكا لە ساڵی ١٩٩٧ كۆچی دوایی كردو چوار ساڵ پێشتریش موریتا لە كاتی یاری تێنیس تووشی جەڵتە بوو، تا ساڵی ١٩٩٩ كە كۆچی دوایی كرد لە سەر كورسی سكە بوو. موریتا ژیانو تێڕوانینی خۆی لە بابەت كارو پیشەسازی كارەباو تەكنەلۆژیای نایاب لە كتێبێك بە ناوی "دروست كراوی ژاپۆن" خستۆتەڕوو. ماندوونەناسی ئەو دوو دۆستو هاوكارە لە وێرانەكانی شەڕی دووەمی جیهانی كۆمپانیایەكی دروست كرد كە پێشەوایەكی بێ ڕكابەری بێت لە داهێنان لە ڕێگای یەك بە دوای یەكو خستنەڕووی بەرهەمی كارەبایی دەنگیو ڕەنگیو IT بۆ خۆی دەستەبەر كرد. سۆنی لە ساڵی ٢٠٠٣ بە ١٦١١٠٠ كارمەند فرۆشی ٦٢ میلیارد دۆلاری بەدەست هێنا.

# چۆن هەڵچوونی کڕیارەکانمان کەم بکەینەوە؟!

و/ دانا محەمەد حسێن

ئەگەر خۆتان خاوەن کارن یان لە کۆمپانیایەکدا کار دەکەن، هەمیشە کڕیارە نارازییەکان بوونیان هەیە، ئەم قۆناغە ساکارانە یارمەتیدەر دەبێت بۆ ڕازیکردنو دڵخۆشکردنی کڕیارەکان:

* خۆڕاگربن، کڕیارێکی بێزار بە هیچ شتێك ڕازی نابێت، جگە لە بڕیارێکی ئومێدبەخش کە پەیوەندیدار بێت بە کێشەکەیەوە، هەڵچوون لە بەرامبەریدا هیچ سودێك بە چارەسەرکردنی کێشەکە ناگەیەنێت.

* نزیکبوونەوە لە کڕیارە توڕەکەو پرسیارکردن لێی بۆ دەرخستنی هۆکاری نارازیبوونی، ئاساییە دووبارە باسکردنەوەی کێشەکە یارمەتیدەر دەبێت بۆ هێمنکردنەوەیان، بۆ نموونە بڵێن من بە تەواوی لەکێشەکەتان دەگەم.

* ئەگەر کڕیارەکە داوای بینینی کەسی چاودێری کەرتی فرۆشتنی کرد پێویستە خێرا ڕێنمایی بکەنو هەموو هەوڵێك بخەنە گەڕ بۆ چارەسەر کردنی کێشەکەی.

* لە دوای ئەوەی کڕیارەکە کێشەکەی خۆی باس کرد داوای لێبوردنی لێ بکەن، لەبەرئەوەی کە کاتتان بە فیڕۆ داوە، ئەوەی پێ بڵێن هەر کارێك کە تواناتاندا هەیە بۆی ئەنجام دەدەن.

* لە دوای گفتوگۆکردن باسی لایەنی باشەی کڕیارەکەتان بکەن شتێك بڵێن کە ئەم کاریگەریەی هەبێت (کەسانێکی وەکو ئێوە هەن کەیارمەتی دەرو ئاسانکەری کاروبارەکانمانن).

* جارێکی تر ئەگەر کە ئەو کڕیارە پەیوەندی پێوە کردنەوە هەتا دەتوانن بەرێز بن لەگەڵیداو پرسیاری لێ بکەن کە چۆنە.

* بەردەوامی بە کێشەکە مەدەن، ئەگەر کڕیارەکە بەڕاستی توڕەیە داوای لێ بکەن کە شوێنەکە بە جێ بهێڵێت یان سەردانی پلەیەکی سەروو لە ئێوە بکات.

* سکاڵا کردنی کڕیارەکە مەگرنە دڵ، تەنانەت ئەگەر پەیوەندی بە هەڵسوکەوتی خۆتانەوە هەبوو، ئەگەر لە ڕووی سۆزدارییەوە تێکەڵی بابەتەکە بوون پاشەکشێ بکەن یان ڕێگە بدەن کارمەندێکی تر درێژە بە بابەتەکە بدات.

* بیر لەوە بکەنەوە ئەگەر خۆتان نارازی بوونایە حەزتان دەکرد چۆن کێشەکەتان چارەسەربێت؟ ئەو کاتە بە هەمان شێوە هەڵسوکەوت لەگەڵ کڕیارەکەتاندا بکەن کە خۆتان حەزتان دەکرد هەڵسووکەوتتان لەگەڵدا بکرێت.

* ئەگەر ناتوانن ئەو شتەی کە کڕیارەکە دەیەوێت بیدەنێ شتێك وەکو دیاری ببەخشن، (لەوانەیە لەم حاڵەتەدا پێویست بە پشتگیری بەڕێوەبەر بکات تا قەرەبوو بکرێتەوە.

* کارێك بکەن کڕیارە توڕەبووەکە دیسانەوە سەردانتان بکاتەوە، نارەزایی کڕیارێك لەوانەیە هۆکارێك بێت بۆ ڕاکێشانی کڕیارەکە، ئەگەر هەڵسووکەوتێکی باشو گونجاوت لەگەڵیدا هەبێتو بەشێوەیەکی کاریگەر داوای لێبوردنی لێبکەیت بیرکردنەوە نێگەتیفەکەی دەگۆڕن بۆ بیرکردنەوەیەکی پۆزەتیف.

* هیچ کات کینە لە دڵ مەبن لەگەڵ کڕیارەکاندا، لە بیرتان بێت کە ئێوە خوازیاری دووبارە گەڕانەوەی کڕیارەکەن ئەگەر سوکایەتی پێ بکەین کڕیارەکە دڵنیا دەبێت کە لە مەودوا دەبێت کارەکەی لە شوێنێکی تر ئەنجام بداتو ئەمەش بە هەموو هاوڕێکانی ڕادەگەیەنێت.

* هەندێك لە کڕیارەکان بە نارازی بوونیان لە هەموو شتێکدا بە ناوبانگن، ئەگەر لەگەڵ ئەم جۆرە کڕیارانەدا هەڵسوکەوتتان کرد هەوڵ بدەن قسە لەگەڵ سەرووی خۆتاندا بکەن کە ئایا ئەم کڕیارە سودی بۆ کۆمپانیاکەتان هەیە؟ یان ئەوەندە دەهێنێت کە لە دەستی بدەن؟ چونکە شتێکی وا کۆمپانیاکەتان ناکات بە دەربڕینی نارەزایەتییە بەردەوامەکانی کاتی کۆمپانیا بە فیرۆ دەدات ئەوکاتەی کە بۆ ئەم جۆرە کڕیارانە بە فیرۆ دەدەن دەتوانرێت بۆ ئەو کەسانە تەرخان بکرێت کە کڕیاری ڕاستەقینەن.

* تکایە لە بیرتان بێت کە پاراستنی ئێوەو هاوکارەکانتانو کڕیارەکانی تر لە پێشترە. ئەگەر کڕیارێك بە سود وەرگرتن لە هەڕەشەکردن لە سنوری خۆی تێپەڕی خێرا سەرووی خۆتان ئاگادار بکەنەوە، کۆمپانیاکان وای بە باش دەزانن کە کڕیارێکی زۆر بڵێ لە دەست بدەن تا کارمەندان، فرۆشیاران یان کڕیارەکانی تر بێزار ببن خراپ تر لەوەش کاروباریان بکەوێتە مەترسیەوە .

سەرچاوە : گۆفاری "موفقیت".

# کچان و کوڕان لە نێوان ئازار و ئاواتدا

## وانەیەک لە (هیوستن)ەوە

**هیوستن:** یەکێکە لە سەرکردە ناودارەکانی ئەمریکا کە بەوە ناسرابوو کەسێکی بە توانابوو لە وتاربێژیدا، کاتێك بەرامبەر ئەندامانی کۆنگرێسی ئەمریکی دەوەستا، بەرەوانبێژترین شێواز دەدواو وتەیەکی دووجار بەکارنەدەهێناو بە شێوەیەك دەدوا کە هەمووانی کە مەندکێش دەکرد.

ساڵی (١٨٣٠) رۆڵێکی گەورەی بینی لە خامۆشکردنی یاخیبوونی هیندییە سورەکانداو قەناعەتی پێکردن کە لەگەڵ حکومەتدا رێکەوتننامە واژۆ بکەن.

لەو کاتەدا سەرۆکی ئەمریکا بانگی کردو پێی گوت: تەکساس سەر بە مەکسیکەو ئایندەی ئەمریکاش بەوەوە پەیوەستەو پێویستە بخرێتە سەر ویلایەتە یەکگرتووەکان، ئەم کارەشم لە تۆ دەوێت!

هیوستن گوتی: بەڵێ باشە، بەڵام پێویستم بە پارەو کەسانی هاریکار هەیە!

سەرۆکی ئەمریکا پێی گوت: ئەگەر پیاوم هەباو پارەی پێویستم هەبا، تۆم بانگ نەدەکرد!

بەڵکو دەبێت تۆ بچیت بە تەنهاو یەك دۆلاریشت پێ نادەم!! تەنها پاسەوانێکت لەگەڵدا دەنێرم تا لە رووباری (مسیسبی) دەپەڕیتەوە، پاشان ئەویش جێت دەهێڵێتو دەگەڕێتەوە!

هیوستن قبوڵی کردو لەوبەری دەریای (مسیسبی)ەوە ماڵاوایی لە پاسەوانەکەی کردو بەرەو تەکساس کەوتە رێ، کاتێك گەیشتە یەکەم شاری ئەو هەرێمە، نووسینگەیەکی پارێزەری کردەوەو بەوپەڕی کارامەییو لێهاتووییەوە کارەکەی ئەنجام دەدا، بە شێوەیەك بە زیرەکیو زۆرزانی خۆی زۆرجار سکاڵاکار دەبووە تاوانبارو تاوانبار بێ تاوان دەردەچووا! تا وای لێهات خەڵکی زۆر پێی سەرسام بوونو ئەویش توانی کاریگەرییەکی گەورەی هەبێت لەسەر بیروهەستو بۆچوونەکانیان، هاوکات توانی قەناعەتیان پێ بکات کە داوای سەربەخۆیی بکەنو بۆ ئەم مەبەستەش بزوتنەوەیەکی رزگاریخوازی دامەزراندو توانی سەربەخۆیی تەکساس رابگەیەنێت.

دواتر وای لێکردن کە داوای چوونە پاڵ ئەمریکا بکەن، هیوستن توانی ئەو قەناعەتەیان لا دروست بکات کە خۆیان داوای ئەوە بکەن بێ هیچ شەڕو خوێنڕشتنو زیانێکی ماددیو مەعنەوی.

پاش چەند ساڵێکی کەم (هیوستن) گەڕایەوەو کلیلی تەکساسی دایە دەست سەرۆکی ئەمریکا بێ ئەوەی تەنها فیشەکێك لەو هەرێمەدا بتەقێتو حکومەتی ئەمریکاش یەك دۆلار لەو پێناوەدا خەرج بکات!

سەرۆکی ئەمریکا سوپاسی کردو وەك یادێك بۆ ناوەکەی ویلایەتی (هیوستن)ی بەناوی ئەوەوە ناونا، کە ئێستا گرنگترین شاری ئەمریکاو پایتەختی نەوتی ئەو وڵاتەیە.

کچانو کوڕانی گەنجو لاو حەزدەکەم بە وردی سەرنج بدەینە ئەم چەند دێڕەی سەرەوەو هەڵوێستەیەك بکەین بەرامبەر بە هەڵوێستی (هیوستن).

هەڵبەت وانەکان زۆرن کە دەکرێت فێری ببین، بەڵام گرنگترین وانە کە ئەگەر سەرنجی بدەینێ ئەوەیە کە (هیوستن) ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە ئەگەر بە تەواوی دوای یارمەتی پەروەردگار پشت بە خۆمان ببەستین دەتوانین گەورەترین کار ئەنجام بدەینو چی دی بەهانەی بێ پارەییو نەبوونی هاوکارو یارمەتیدەر نەهێنینەوە.

ئەگەر بە تەواوەتی هیممەتمان بەرز بێتو تواناو وزەی خۆمان بخەینە گەڕ ئەوا دەتوانین (هیوستن) ئاسا زۆر کاری گەورە ئەنجام بدەین خزمەتی مەزن بە خۆمانو وڵاتو نیشتمان بکەین.

**کەواتە چاوەڕوانی چی دەکەیت!! رووباری دوو دڵیت ببڕەو بەرەو سەرکەوتن هەنگاو بنێ!**

# دە هەنگاو بۆ بیرکردنەوەی ستراتیژییانە..

ژیلە دابان

١- شیکردنەوەی ژینگەی ناوخۆیی‌و دەرەکی بە کارهێنانی شیکردنەوەی (SWOT) کە لە ڕێگایەوە دەتوانین هەموو ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە جیهان‌و دەرەوە ڕوودەدەن شییان بکەینەوە بۆ دۆزینەوەی ئەوەی کە ژینگەی دەرەکی بەردەستی دەخات لە دەرفەت یا ئەوەی کە لە دەرەنجامیدا ڕوودەدات لە ترسناکی‌و بەربەستەکان، لەگەڵ دووبارە چاو خشاندنەوە بەم شیکردنەوانە بە شێوەیەکی ڕێك‌و پێك‌و وردبین‌و بۆ ماوەیەك کە زیاتر نییە لە شەش مانگ تاوەکو زانیاری کۆبکاتەوەو ئاگاداری ئەو گۆڕانکارییانە بێت کە لە دوایدا ڕوودەدەن‌و ئامادەباشی بکات بۆ ڕووداوی لە ناکاو، ئەمەو سەرەڕای بەکارهێنانی لە ڕێگای (PPEST) ئەمەش وشەیەکە لە شەش فاکتەر هاتووە بۆ ئەم ڕێگایە بە مەبەستی ناساندنی ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە ژینگە ڕوودەدەن وەك ڕامیاری Political، سروشتی Physical، ئابووری Economic، کۆمەڵایەتی Social، تەکنەلۆژی Technological ، بازرگانی Trade.

٢- شیکردنەوەی بەهای خستنە سەر: ئەمەش کارگێڕییەکی شیکردنەوەیە کە (میشیل پورتر) دایهێنا تاوەکو باڵە فڕە بە بیرەکان بدات تا دوورترین خاڵ بە واتای ڕوانین بۆ بەرزی هەروەك کە لە ناو فڕۆکە بیت‌و بتەوێت وێنەیەکی گشتی بکێشیت، لێرەدا تیشك دەخرێتە سەر جیاکەرەوەی ڕکابەری کردن کە لە دەرەنجامی بەهای خستنە سەری دیاریکراو دروست بووەو ڕێکخراو بە دەستی هێناوە بۆ بەراووردکردنی بە هەمان بەهای کە ڕێکخراوەکانی تر دەستیان کەوتووە، ئاساییە کە خاڵێك یا ناوچەیەك بدۆزیتەوە کە لە ڕێگایەوە بە هایەکی خستراوە سەرمان بە دەست بکەوێت کە بتوانین پشتی پێ ببەستین لە کاتی بەراوورد کردن لە گەڵ ڕێکخراوەکانی تری هاوشێوەو ڕکابەر.

٣- شیکردنەوەی باری ڕکابەران: ئەمەش بە ڕوانین و بە هێزی دەرەکی بۆ هەڕەشەکردن کە بریتییە لە باری ڕێکخراوە بازرگانییەکان لە سەرهەڵدانی بەرهەمێکی نوێ کە بۆ یەکەم جار دەکەوێتە بازاڕ یان سەرهەڵدانی بەرهەم گەلێکی نوێ...... هتد، هەر بۆیە کە دەبێت لەم بارەدا توانای ئابووری ڕێکخراو لە بەرچاو بگرین لە بەرامبەر ڕێکخراوەکانی تری ڕکابەرو باری بازاڕو توانای ئابووری کڕیاران‌و گۆڕانکاری لە باری ڕکابەری‌و کارلێککردن لە نێوانیان‌و باشتریشە کە شێوەیەکی لە یەککردنەوەو بیرکردنەوەی هەبێت.

٤- سەرکەوتن لە نێوان فاکتەرە سەرەکییەکانی ژینگە: ئەمەش هەوڵێکە بۆ پێشبینی کردن بەوەی کە فاکتەرە سەرەکییەکان دەیان بێت کە لەوانەیە کاریگەری هەبێت لە سەر داهاتووی ڕێکخراو و بەدواداچوونی بە شێوەیەکی ڕێك‌وپێك، ئەمەش بە دانانی شێوەیەکی لێکدانەوەی بۆ ڕووبەڕووبونەوەو تێگەیشتن لە گۆڕانکارییە نا یەکسان‌و دڵنیانەبووەکانی کە ڕووبەڕووی ڕێکخراو دەبێتەوە.

واباشە کە لەم ڕێگایەدا شێوازی بیرکردنەوەی پابەندبوون‌و هتد، لە هۆیەکانی گەڕان بە دوای هەر هێمایەك هەتا ئەگەر هاتوو سادەش بوو بۆ پێشبینی کردن بەو گۆڕانکارییە گەورانەی کە لە سەرەتادا ڕوودەدەن.

٥- ئامادەکردنی کۆمەڵێك سیناریۆی ئەلتەرناتیڤ بۆ داهاتوو: ئەمەش لە ڕێگای هەوڵدان بۆ هەستکردن بە ژینگەی دەرەکی‌و تێبینی کردنی هەر هێمایەکی لاواز کە زۆرجار ئاگادارکەرەوەیە بۆ ڕوودانی گۆڕانکاری سەرەکی‌و گەورە.

٦- تاوتوێکردن‌و شیکردنەوەی سیناریۆکانی داهاتوو: لە دوای دانان‌و شیکردنەوەی‌و سەرەڕای شیکردنەوەی شوێنەوارە جیاوازەکانی کە لە هەموو سیناریۆکان ڕوودەدەن لە سەر ڕێکخراو.

٧- بڕیاردان سەبارەت بە سیاسات‌و ستراتیژییەتی تایبەتی ڕێکخراو.

٨- بڕیاردانی تایبەت بە دابەشکردنی ستراتیژی سەرچاوەکان بە زامنی دەستخستنی ئەم ستراتیژی‌و توانستانە.

٩- دەست پێکردنی پرۆسەی پلاندانانی ستراتیژی.

١٠- دووبارە پێکهێنانی پرۆسەکانی (تغذیە عکسیە) تاوەکو ئەو گۆڕانکارییانەی ژینگە ببەستینەوە بە پلانەکان‌و ستراتیژییە جیاوازەکان.

# بۆنی تۆ ئەمڕۆ لە بۆنی دایکم دەچێت!

یەکەم ڕۆژی دەستپێکردنەوەی خوێندن بوو، لەو کاتەی قوتابیان بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە بەرەو پۆلەکانیان دەڕۆیشتنو بە وتەی هەست ناسكو وەسفی جوان باسی کردنەوەی دەرگای قوتابخانەکانو دڵسۆزی مامۆستا بەڕێزەکانیان دەکرد، هەر یەك لە مامۆستا بەڕێزەکانیش لە بەردەمی یەکێك لە پۆلەکاندا ڕاوەستابوون بۆ پێشوازی کردن لە قوتابییەکانیان، مامۆستایەکیش کە لە بەردەمی پۆلی پێنجەمدا راوەستابوو، گوێبیستی ئەو وتە ناسکانە بوو کە لە زاری قوتابیەکانەوە دەردەچوو، بە پەرۆشەوە بۆ قوتابییەکانی ڕوانیو پاش بە خێرهاتنەوەو پیرۆزبایی کردن، پێی وتن: هەمووتانم زۆر خۆش دەوێت، هەروەها هەموو مامۆستاکانیش وەکو من ئێوەیان خۆشدەوێت، بەڵام یەکێك لە قوتابییەکان کە لە بەردەم پۆلەکەی من دانیشتبوو لە دڵی خۆمدا جیام کردبۆوە چونکە زۆر لاواز بوو لە وانەکانیدا، بانگیان دەکرد (تیدی ستودارد)·

ئەمە لە کاتێکدا بوو کە لە ساڵی رابردوودا خاتوو (تومسون) چاودێرییەکی وردی تیدی کردبوو، تێبینی کردبوو کە تیدی لەگەڵ هاوڕێکانی یاری ناکات، هەمیشە جلوبەرگەکانی چڵکنە، وا دەردەکەوێت کە هەمیشە پێویستی بە خۆشۆرین هەیە، سەرەڕای هەموو ئەوانە هەموو کات وەکو کەسێکی خەمبار دەردەکەوت·

بەڕێوەبەری قوتابخانە داوای لە خاتوو (تومسون) کرد، کە پێداچوونەوەیەك بکات بەسەر تۆماری ساڵی رابردووی هەر یەك لە قوتابیان، لە کۆتاییدا تۆماری تایبەتی تیدی چاوپێکەوت، لە کاتی پێداچوونەوەی ئەو تۆمارەدا شتێکی سەیری بەدیکرد، کە بووە مایەی سەرسوڕمانی!

* مامۆستای پۆلی یەکەمی تیدی سەبارەت بە تیدی نووسیبووی، (تیدی قوتابییەکی زیرەكو پاكوخاوێنو خاوەنی رۆحێکی هاریکارییە، بە ڕێکوپێکیو زۆر بە وردی گرنگی بە وانەکانی دەدات، هەروەها خاوەن رەوشتێکی بەرزو جوانە)·

* مامۆستای پۆلی دووەمیشی سەبارەت بە تیدی بەم شێوەیە نووسیبووی: (تیدی

و/ بەرزان ئەبوبەکر ڕەشید

قوتابییەکی ڕێکوپێکە، لای هەمووو هاوپۆلەکانی خۆشەویستە، بەلاّم هەمیشە خەمبارو نیگەرانە، بە هۆی ئەوەی کە دایکی تووشی نەخۆشییەکی کوشندە بووە، ژیانیان لە نێو ماڵدا پڕ بووە لە ناڕەحەتیو نا ئارامیو پشێویو تەنگوچەڵەمە).

* مامۆستای پۆلی سێیەمی سەبارەت بە تیدی نووسیبووی: (بە هۆی مردنی دایکییەوە تیدی تووشی بارگرانی هاتووە، هەرچەندە ئەوپەڕی هەوڵی داو زۆر خۆی ماندوو کرد، بەلاّم نەیتوانی بەسەر گرفتەکەیدا زاڵ بێت، چونکە سەرەڕای مردنی دایکی، باوکی گرنگییەکی ئەوتۆی پێ نەدەدا، ئەم جۆرەی ژیانی لە نێو ماڵدا زۆر کاریگەی خراپی لەسەر دەروونی تیدی دروست کردووە).

* لەو نێوەندەدا مامۆستای پۆلی چوارەمی سەبارەت بە تیدی نووسیبووی: (تیدی کەسێکی داخراوەو زۆر حەز بە خوێندن ناکات، هەروەها بە هۆی گۆشەگیرییەکەیەوە خاوەنی هاوڕێیەکی ئەو تۆش نییە، زۆر جاریش لە کاتی وانە وتنەوەدا لە نێو پۆلەکەیدا خەوی لێ دەکەوێت).

لێرەدا خاتوو (تومسون) هەستی کرد کە تیدی گرفتێکی هەیە، بەلاّم هەستی بە شەرمەزاری کرد بۆ ئەو تێڕوانینەی لەوەو پێش هەیبووە لەسەر تیدی، ئەم هەڵوێستەش ئەوەندەی تر کارەکەی خراپ کرد لە کاتێکدا قوتابییەکانی تومسون بە بۆنەی یادی لە دایك بوونییەوە دیارییان پێشکەش کرد، هەر یەك لە قوتابیەکان بە شێوەیەکی جوان لە زەرفێکی تایبەتدا دیارییەکانیان پێشکەشی مامۆستاکەیان کرد، جگە لە تیدی کە دیارییەکەی زۆر بە نارێکوپێکی لە عەلاگەیەکی ڕەنگ تاریکدا پێشکەشی خاتوو (تومسون) کرد، لە ناکاو هەموو قوتابییەکان دەستیان کرد بە پێکەنین، کاتێك بینیان دیارییەکەی تیدی بریتییە لە ملوانکەیەکی ئەڵماس بەلاّم تەزویر، لەگەڵ شوشەیەك عەتر کە تەنها چارەکێکی تێدا ماوە! ئەوەی جێگەی تێڕامان بوو ئەوەبوو بە خێرایی قوتابییەکان بێدەنگ بوونو پێکەنینەکەیان نەما، چونکە بینیان خاتوو (تومسون) زۆر بە گرنگییەوە ڕوانییە دیارییەکانی تیدیو سەرسامی خۆی لەو ملوانکە جوانە دەربڕیو دەستبەجێ کردییە گەردنیو کەمێك لە عەترەکەشی پرژاند بە مەچەکیدا، ئەو ڕۆژە تیدی نەڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە چاوەڕێی کرد تا گەیشت بە خاتوو (تومسون)و پێی گوت: بۆنی تۆ ئەمڕۆ لە بۆنی دایکم دەچێت!!

قوتابییەکان ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵەوەو قوتابخانەیان جێهێشت، خاتوو (تومسون) کە قسەکانی تیدی زۆر کاری تێکردبوو، نزیکەی یەك کاتژمێر دەستی کردە گریانو چاوەکانی هۆن هۆن فرمێسکیان هەڵدەوەراند، لەبەرئەوەی تیدی ئەو شوشە عەترەی پێشکەش کردووە، کە پێشتر دایکی بەکاری هێناوە، هەر بۆیە تیدی بۆنی دایکی کۆچ کردووی لە خاتوو تومسوندا دەبینێت!

هەر لەو ڕۆژەوە تومسون دەستی هەڵگرت لە وتنەوەی وانەیەك کە تەنها خوێندنەوەو نووسینو بیرکاری بێت... بەڵکو دەستی کرد بە وتنەوەی هەموو وانەکانی منداڵ، (مامۆستای وەرز)، هەروەها لە پێشینەی کارەکانیدا گرنگی دانی تایبەت بوو بە تیدی، کاتێك گرنگی تایبەتی دا بە تیدی، بینی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تیدی باشترو چالاکتر دەبێت، هەر کات هانی ئەدا زۆر بەخێرایی کاری تێ دەکرد، بە کۆتایی هاتنی ساڵی خوێندن، تیدی بووە یەکێك لە قوتابییە باشەکانی ئەو ساڵە، زیرەکی زیاتر وەدەردەکەوت! پاش تێپەڕبوونی ئەو ساڵە خاتوو تومسون ڕۆژێکیان نووسراوێکی بینی لە بەردەرگاکەیدا، کە تێیدا نووسرابوو (بە ڕاستی باشترین مامۆستام کە لە ژیانمدا چاوم پێکەوتبێ خاتوو تومسون)ە!

شەش ساڵ تێپەڕی بێ ئەوەی هیچ نووسراوێك یان هەواڵێکی لە تیدی یەوە پێ بگات، پاش ئەو شەش ساڵە نامەیەکی لە تیدی یەوە پێگەیشت، دوای هەواڵ پرسینو سوپاسو ڕێزو پێزانینو دەربڕینی وەفاداری، تیایدا نووسیبووی کە بە سەرکەوتوویی قۆناغی ئامادەییم تەواو کردووەو پلەی سێیەمم بە دەستهێناوە، بەلاّم هەتا ئێستا تۆ چاکترین مامۆستامی کە لە ژیانمدا پێی گەیشتبم!

دوای تێپەڕبوونی چوار ساڵی دیکە، پەیامێکی دیکەی لە تیدی یەوە پێگەیشت کە تیایدا هاتبوو: (بەم نزیکانە بە پلەی یەکەم کۆلێژ تەواو دەکەم، بەلاّم هەتا ئێستا لە لای من باشترینو دڵسۆزترین مامۆستامی).

پاش تەواوبوونی چوار ساڵی دیکە، تومسون پەیامێکی تری لە تیدی یەوە پێگەیشت، ئەمجارەیان نووسیبووی دوای ئەوەی توانیم بڕوانامەی بەکالۆریۆس بە دەست بهێنم، بڕیارمدا زیاتر بخوێنم، لە پەیامەکەیدا جارێکی تر جەختی لەوە کردبۆوە کە خاتوو تومسون باشترینو خۆشەویسترین مامۆستایەتی کە لە ژیانیدا پێی گەیشتووە، بەلاّم لە کۆتایی پەیامەکەی ئەمجارەدا ناوەکەی درێژتر بوو لە جاران، ئەو نوسیبووی (دکتور/ ثیودور إف ستودارد)!!

لێرەدا چیرۆکەکە کۆتایی نەهاتووە، لە بەهاری ئەو ساڵەدا پەیامێکی دیکەی نارد بۆ خاتوو تومسون، تیایدا نووسیبووی: (ئێستا کچێکم ناسیووەو دەمەوێت بیخوازمو بیکەمە هاوسەرو هاودەمی ژیانم، هەروەکو لە پێشدا هەواڵم پێ دابووی کە باوکیشم پێش دوو ساڵ لە مەوبەر کۆچی دوایی کردووە، هەر بۆیە داوا لە بەڕێزت دەکەم کە تەشریف بهێنی بۆ ئاهەنگی گواستنەوەمانو لە شوێنی دایکی ئازیزم دابنیشی، خاتوو تومسونیش بە خۆشحاڵییەوە داواکەی قبوڵ کرد، ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەبوو کە خاتوو تومسون ئەو ملوانکەی کردبووە ملی کە چەند ساڵ لەوەوبەر تیدی پێشکەشی کردبوو، لەو جۆرە بۆنەشی بەکارهێنابوو کە تیدی پێشکەشی کردبوو)!!

دوای بەخێرهاتنێکی گەرمی مامۆستا بە وەفاو دڵسۆزەکەی، (دکتور ستودارد) بە ئەسپایی بە گوێی مامۆستاکەیدا چپاندو پێی وت: زۆر سوپاس بۆ ئەو متمانەیەی بە منت هەبوو، هەروەها سوپاسی بێپایانم بۆ ئەو هەوڵە زۆرەی کە لەگەڵ منت داو وات لێکردم هەست بە گرنگی خۆم بکەم، پێی ڕاگەیاند کە تۆ هۆکاری دەرکەوتنو پێگەیشتنی من بوویت.

خاتوو تومسونیش کە چاوەکانی پڕ ئەسرین بوون، وەلاّمی دایەوەو وتی: تۆ لە هەڵە دایت، چونکە تۆ فێرت کردم کە من چۆن ببمە مامۆستایەکی لێهاتوو بە توانا،من نەم دەزانی چۆن وانە بڵێمەوە هەتا گەیشتم بە تۆ.

(تیدی ستودارد) ئەو پزیشکە بە ناوبانگەیە کە نەخۆشخانەیەکی تایبەتی هەیە بە ناوی مەڵبەندی (ستودارد)، بۆ چارەسەرکردنی شێرپەنجە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئێستا گەورەترینو باشترین مەڵبەندی چارەسەری شێرپەنجەیە نەك تەنها لە ئاستی شارەکەیدا، بەڵکو لەسەر ئاستی هەموو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا.

# هێزی خۆشەویستی!

زاهیر زانا

خۆشەویستی سیحری بەردەوامبوونی ژیانو خۆراکی دەروونی مرۆڤو پاڵنەری پەیوەندییە ڕۆحیو دەروونیو کۆمەڵایەتییەکانە، هەوێنی دەروونێکی ئاسودەو ژیانێکی بەختەوەرە.

خۆشەویستی خاوەنی هێزێکی گەورەیەو هەر خۆشەویستییە کە هێزی بەخشیوەتە دایکەکان تا منداڵەکانیان بەخێو بکەنو بە درەنگانی شەوو درێژایی ڕۆژ بۆ خزمەتو پەروەردەکردنی ئەوان بخەنە سەریەکو بۆ ئەو هەموو نارەحەتییەش بە ئاسانی بڕوانو چێژی لێ وەربگرنو بە خەندەیەکی خۆشەویستی هەموو هیلاکیو ماندویەتییەکیان بڕەوێتەوە، خۆشەویستییە وا لە مرۆڤ دەکات نانو ئاو نەخواتو لەبەرخاتری خۆشەویستی خودا بەڕۆژوو بێت.

هەر خۆشەویستیشە مرۆڤ والێدەکات گیانی بەخت بکاتو بەسەر شاخەکاندا سەربکەوێتو نیگارو نەخشیان لەسەر بنەخشێنێت،

فاکتەرێکی سەرەکی بەختەوەری خۆشەویستییە، خۆشەویستی شەکری شیرینکردنی چای ژیانەو ئاوە بۆ گەشەو نەشونمای درەختی کامەرانیو ئاسودەیی ڕۆحیو جێگیری دەروونی، دەبا هەمیشە خۆشەویستی کاڵای بەری باڵای ژیانمان بێتو بۆ ئەمەش ئەم چەند خاڵە دەخەینە ڕوو:

١- خۆشەویستی خوای گەورەو پاشان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) با هەمیشە لەدڵتدابێ، چونکە ڕۆحت شادو گەشو دەروونت ئارام دەکات، پەیوەندیت لەگەڵ ئاسماندا لەگەڵ سروشتی خۆتدا تەبایەو بەختیاریت پێدەبەخشێتو وات لێدەکات خۆشییەکانی ژیان بە بەخششی ئەو بزانیتو ناخۆشییەکانیشی بە تاقیکردنەوە بزانیتو ئارامیان لەسەر بگریت.

٢- خۆشەویستی بۆ هەموو مرۆڤێك: کەسانی ترت بێ بەرامبەر خۆشبوێتو ڕێزی کەسایەتیان بگرەو هەموو مرۆڤێکت خۆشبوێو دڵنیابە هەمووانیش تۆیان خۆشدەوێت.

٣- خۆت خۆشبوێتو ڕێزی کەسایەتی خۆت بگرەو بەو بارودۆخەی ئێستا تێیدایت ڕازیبەو هەمیشە هیوات بە ئایندەیەکی گەشتربێتو لە خوای گەورە بخوازە کە یارمەتیت بدات سبەینێت لەمرۆ باشتر بێت، بۆ ئەمەش هەمیشە لە هەوڵی بەردەوامدا بە.

٤-خۆشەویستی پیشەو کارەکەت وات لێدەکات کارکردن بە ئەرکو ماندوبون نەزانیتو چێژ لە هەموو ساتەکانی کارکردنت وەربگریت، بە هۆی خۆشویستنی پیشەکەت بەرهەمی زیاترو بەرەو پێشچونی باشترو داهێنان لە کارو پیشەکەتدا بهێنە دی، دەبا کاتەکانی کارکردنمان بە خۆشەویستییەوە بەڕێ بکەینو بۆ ژیان پێبکەنین تا ژیان بۆمان پێبکەنێت.

٥- خۆشەویستی خێزانی هۆکارێکی گرنگە بۆ بەختەوەری کامەرانیو هێزێکی گەورەی دەرونیمان پێ دەبەخشێت، مرۆڤ کاتێك لە خێزانێکدا دەژی کە خۆشەویستییەکی پتەو لە نێوان ئەندامەکانی ئەو خێزانەدا هەبێت، هیچ هۆکارێکی دەرەکی ناتوانێت بەختەوەریو ئاسودەیی ڕاستەقینەی لێ بسەنێتەوەو ڕێگای ژینی هەرچەندە سەختو دژوار بێت بە ئاسانی پێیدا گوزەر دەکاتو تەنگو چەڵەمەکان لە بەرچاویدا بچوكو لاواز دەبن.

٦- خۆشەویستی نیشتیمانو کۆمەڵگا وا لە مرۆڤ دەکات هەستێکی کۆمەڵایەتی ڕۆحی گەورەی بۆ دروست ببێتو خۆی بە ئەندامی کۆمەڵگەو کۆمەڵگە بە پشتیوانی خۆی بزانێتو ئەمەش هەستێکی زیاتری خۆشەویستیو ئاسودەیی پێ ببەخشێت.

٧- خۆشەویستی چاکەکاری، چاکەکردن دڵو دەروونی مرۆڤ ئاسودەو کامەران دەکاتو خۆشەویستییەکی سروشتی هەیە لە بونیادی مرۆڤدا بۆ چاکەکردنو بەخشینو هاوکاریو یارمەتی کەسانی تر.

بەو هیوایەی بەخۆشەویستییەوە بژینو هەوڵبدەینو بەردەوام بین، بە خۆشەویستی تاڵییەکان بگۆڕین بۆ شیرینو تاریکییەکان بۆ ڕووناکیو سەختییەکان بۆ تەختیو خراپەکان بۆ چاکەو ناخۆشییەکان بە خۆشی، با هەمیشە بە خۆشەویستییەوە بژینو خۆشەویستیمان خۆشبوێت.

# گرنگی عەقڵ لە ژیانی مرۆڤدا

کارزان سلیم

یەکێك لەگرنگترینو سەرەکیترین جیاکارەکانی مرۆڤ لە بوونەوەرە بایەلۆژیەکانی تر بریتییە لەوەی کە خاوەنی عەقڵو ئیرادەیە، هەموو ئیرادەیەکیش لە عەقڵەوە سەرچاوەدەگرێت، بەمەش ئیرادەو جموجۆڵی ئاژەڵەکان لەگەڵ مرۆڤەکاندا جیاوازی هەیە، واتە مرۆڤ لە ڕێگەی عەقڵەوە دەتوانێت غەریزەکانی ئاراستە بکات، نموونەیەك لە ئاکاری مرۆڤ بوون بوونیات بنێت، چونکە مرۆڤ ئەگەر بەدەر لە عەقڵو تەنها لە چوارچێوەی غەریزەکانیدا کاربکات ئەوا تەنها هەڵسوکەوتی ئاژەڵەکان بەرهەم دەهێنێت، بەمەش پەیوەندییەکانی کۆمەڵگەی مرۆیی بەرەو هەرەس دەچێت٠

ئەگەر بەراوردێك بکەین لە نێوان مرۆڤو گیانەوەرانی تر لە ڕووی ئەم چوار هەستەوەرە، (بینینو بیستنو بۆنکردنو تامکردن) ئەمانە لە ڕووی پێکهاتەوە بەشێکن لە هەردوو بونەوەر، بەڵام ئەوەی کە جیاوازە تیایاندا، ئاژەڵان دەبینن و دەبیستن و بۆندەکەن و تام دەکەن، بەڵام دەرك پێکردنی هەر یەکێك لەم کارانەی کە دەیکەن نایزانن و یان دەبێت بە هۆی هەریەکێك لەم ڕووداوانە چی بکەن ئەمەش نازانن، بەڵام مرۆڤ بە هاوبەشی لەگەڵ ئەمانەو بە جیاوازی لەوەدا کە مرۆڤ خاوەنی عەقڵەو بە هۆی ئەم هێزە مەعنەوییەوە دەتوانێت درك یان پێشبینی بۆ ڕووداوەکان بکات٠

د٠ دین سیمونتون مامۆستای زانستی دەروونی لە زانکۆی سیمتۆن چەندان لێکۆڵینەوەی ئەنجامداوە لەسەر داهێنانو زیرەکی لە کۆتاییدا گەیشتۆتە ئەنجامێك لەسەر زیرەکیو داهێنان دەڵێت: کەسانی وەکو (ئەنیشتاینو ئەدیسۆن) بەشێوەیەکی زۆر زیرەك نەبوون ئەوەی ئەوان زۆر پشتیان پێبەستووە تواناکانی عەقڵی ناوەکی بووە٠ تواناکانی عەقڵ زۆر بەهێزن هەندێك لە لێکۆڵینەوە زانستییەکان دەڵێن: مێشکی زیرەکترین کەس ١٪ی خانەکانی مێشك دەگرێتو ئەوەی تری بە بەتاڵی دەمێنێتەوە، بەڵام هەندێك لێکۆڵینەوەی نوێتر هەن دەڵێن: ٩٩٪ی مێشکی مرۆڤ بە بەتاڵی دەمێنێتەوە تەنها ١٪ی زانیاری وەردەگرێت٠

زانای بەناوبانگ ئیسحاق ئەزیموف چەند پرسیارێکی گرنگ دەوروژێنێت دەربارەی ڕاستییە زانستییەکان کە پەیوەستن بە عەقڵەوە:

١- ئایا بۆچی بەشێوەیەکی باشترو چاکتر هەوڵنادەین؟ لە کاتێکدا دەماخی مرۆڤ لە ٥٠٠ ملیۆن خانە پێکهاتووە!

٢- ئایا بۆچی بەشێوەیەکی باشتر بیرهێنانەوەمان ناپارێزین؟ لە کاتێکدا عەقڵمان دەتوانێت (١٠٠) ملیۆن زانیاری هەڵگریو بیپارێزێت!

٣- ئایا بۆچی بەشێوەیەکی باشتر بیر ناکەینەوە؟ لە کاتێکدا عەقڵمان زیاتر لە (١٠٠) ترلیۆن دەماری تیایە!

٤- ئایا بۆچی توانای داهێنانمان بەکار ناهێنین؟ لە کاتێکدا دەتوانین (٤٠٠٠) بیرۆکە وەربگرین لە هەمووی ٢٤ کاتژمێرێکدا!

سەرچاوە: ڕۆڵی عەقڵ لە گەشەپێدانی لاواندا٠

## وانەیەک بۆ ژیان

منداڵ بە بچوکی گاڵتە بە ژیان دەکات، بەڵام نازانێت کە گەورەبوو ژیان گاڵتەی پێ دەکات!!

# گەر ڕێگایەك دیاری نەكەیت لە كۆتایی ڕێدا پەشیمان دەبیتەوە!!!

گوڵان محەمەد ئەمین

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕەوشتو ئاكاری كچەكەم دەگۆڕا، سەرسام بووم بە ڕەوشتەجوانەكانی، هەمیشە ناوی مامۆستاكەی لەسەر زاری لانەدەچوو باسی دڵسۆزیو ڕەوشتو زانستو سیفەتە بەرزەكانی مامۆستاكەی دەكرد، هەر كات ئەوسیفەتە بەرزو ناوازەو زیرەكییەی مامۆستاكەی باس دەكرد من دەگریامو تەنها خۆشم لە واتای گریانەكەم تێدەگەیشتم! دەمگوت مرۆڤ وێنەی پارچە تەختەیەكە گەر بە تەنها خرایە دەریایەكەوە هیچ بەهاو قورساییەكی نییەو شەپۆلی دەریا بۆ هەركوێیەكی بوویێت دەیبات، بەڵام هەر ئەوپارچە تەختانە گەر ئەندازیارێك بیبەستێت دەتوانێت باشترینو نایابترین پاپۆڕی لێ پێك بهێنێتو كۆنتڕۆڵی ڕۆیشتنیشی لە ژێر دەستی كاپتنە كەیدایەو بە سەدان مرۆڤ لێی سوودمەند دەبنو لە دەریا سامناكو مەزنەكان پێی دەپەڕنەوەو بەسەر شەپۆلە بەهێزەكاندا زاڵ دەبێت!! هەر بۆیە ڕۆژێك پرسیم ئەم مامۆستا كارامەو ناوازەیەی تۆ باسی دەكەیت كێیەو ناوی چییە؟ زۆر بە هێمنی باسی ناوو هەموو ناونیشانو وەسفەكانی بۆ كردم، بەڵام ئازیزان ئەم چیرۆكە بۆ من زۆر دژوار بوو، چونكە هەموو ڕۆژە بە هەدەرچووەكانی ژیانمی هێنایەوە یادم، هۆكاری سەر نەكەوتنی ژیانم تێداخوێندەوە هەرچیم هەبوو دەمبەخشی بەوەی بگەڕێمەوە بۆ ئەو كاتەی تەمەنم، چیرۆكی ئەو مامۆستایەی كە لە تەمەنی لاویدا پێكەوە خوێندكار بووین!!!

من بە گاڵتەو پێكەنینو كات بە فیرۆدان ژیانم دۆڕاندو بە نرخترین شت كە تەمەنی لاویم بوو بە بامدا!!

ئەویش وەك ئەندازیارێكی ژیان سازی بینای ژیانی سازاندو ڕووبەڕووی هەموو ئاستەنگەكانی ژیان بووەوەو ئێستا بە وێنەی چیایەكی بڵند كۆشكی ژیانی سازاندووە!!!

ئێستا دەزانم بە هۆی ئەم ئاكارانەی گەیشتە ئەو پلەیە:

* بەردەوام باسی گرنگیو گەورەیی زانستو پاداشتی زانست خوازانی بۆ دەكردینو ئەم ئایەتەی بۆ دەخوێندینەوە (یرفع الله الذین منوا والذین أوتواالعلم درجات).

*هەرچی بزانیایە لە ژیانیدا ڕەنگی دەدایەوە.

* هەمیشە پەنجەی ڕێزو خۆشەویستی بۆ درێژ دەكراو ببووە سنبولی ئاكارو ڕەوشتی جوانو وەك گوڵێكی بۆنخۆش وابوو لە هەر كوێ بووایە ئەو شوێنەی بۆنخۆش دەكرد.

* بەردەوام فێری دەكردین كەنییەتمان بۆ خوا بێت لە پێناوی خزمەت بە مرۆڤایەتیدا بە كاری بهێنین.

* بەردەوام هەستی بە چاودێری خوای گەورە دەكرد، ئەو ڕەوشتو ئاكارانەی كە مامۆستا چاوی لێ نەبووایە ئێمە دەمان كرد، ئەو هەرگیز وانەبوو چاودێری خوا لە هەمووشت گەورەتر بوو لە لای.

* هەركات ئێمە كۆدەبووینەوە قسەی بێ سودو پێكەنینو باسی هاوڕێكانمان دەكرد ئەو ئاگاداری دەكردینەوە كە لە هەڵەداین گەر گوێمان پێ نەدایە ئەوا ئەو شوێنەی جێ دەهێشت.

* لەگەڵ ئەو هەموو سیفەتە بەرزو زیرەكییەیدا زۆرخۆی بە كەم دەزانی، بە وێنەی گوڵە گەنم دەهاتە پێش چاوم چۆن تاقورستر بێت زیاتر ملكەچ دەكات، ئەویش زیاتر سەنگینو ملكەچو خاكی دەبوو.

* كەمترین كاتی بە فیرۆ نەدەدا هەموو ژیانی بەرنامەڕێژ كردبوو، ئەو كاتانەی ئێمە بێ كار دەسوڕاینەوە ئەو خۆی بە خوێندنەوەو هەوڵدانەوە خەریك دەكرد.

* ئێمە وشەكانمان زۆر بە سادەیی وەردەگرت بەڵام ئەو چەندین واتای لێ دەردەهێناو گوزارشتی لە بینینی هەر دیمەنێك دەكرد زۆر بە جوانی، بەوەش هزرو بیرێكی فراوانو ناوازەی بۆ دروست ببوو.

* لە كاتی وانە خوێندندا زۆر چالاكو بە ئاگا بوو.

* لە كاتی پێویستدا پرسیاری زۆر جوانو بە سوودی دەكرد.

* بەبێ مۆڵەتی مامۆستا قسەی نەدەكردو وەڵامی نەدەدایەوە.

* موناقەشەی نەدەكردو دڵی هەموو كەسێكی لاگەورەبوو.

* زۆر ڕێزی لە ڕاو بۆچوونی مامۆستا دەگرت، بە تایبەت لە كاتێكدا بیروڕای جیاواز بووایە بە مەش ببووە خۆشەویستی سەرجەم مامۆستایان.

* لە كاتێكدا مامۆستا هەڵەیەكی بكردایە بەوپەڕی دانایییەوە هەڵەكەی لە شێوازی پرسیاردا ئاڕاستەی مامۆستا دەكردو خۆی دەكرد بە خاوەنی هەڵەكە تابیری مامۆستای دەخستەوە.

*ناوی مامۆستاكانی بە خراپە نەدەبردو زۆر بە وەفابوو بەرامبەریان.

* زۆرجار هەندێ قوتابی بە مەبەستی زانینی ئاستی زانستی مامۆستا پرسیاریان دەكرد، بەڵام ئەو ئەم كردەوانەی زۆر لا ناشیرین بوو، هەرگیز وای نەدەكردو شەرمی دەكرد بەرامبەر مامۆستا بەو جۆرە مامەڵە بكات.

* هیچ كات دڵگران نەدەبوو لە مامۆستا گەر توڕەشببونایە، چونكە دەیزانی لە دڵسۆزییاندایە.

* گەر زانیاری لە بابەتو وانەیەكیشدا هەبووایە بە جوانترین شێوە گوێی دەگرتو سەرقاڵ نەدەبوو.

* پشتی بە خۆی دەبەستو خۆی ماندوو دەكردو چاوەڕوانی وەڵامی لە هاوڕێكانی نەدەكرد.

* بەخیل نەبوو لە زانستدا دەیگوت: ئەو زانستەی وەرمانگرتووە گەر لێی نەبەخشین زیاد ناكاتو بەرهەمدار نابێت.

* زۆرپشتی بە خوا دەبەستو فێری

دەکردین کە پشت بەخوابەستینو دڵخۆشبین بە هاوکاری پەروەردگارو باسی ئەم ئایەتەی بۆدەکردین (من یتوکل علی الله فهو حسبه)·

* جارجار یادی دەخستینەوە کە ئەم پاڕانەوە قورئانییە لە یاد نەکەین (رب زدنی علما)·

* ئێمە دەمانگوت خۆزگە خوێندنمان تەواو دەکرد تا زوو بڕوانامەیەك بە دەست بهێنینو دابمەزرێینو موچەیەك وەربگرین!! بەڵام ئەو لەم دونیا تەنگەدا نە دەژیاو ئاسۆی بیری ئەو بەرەو شتە بە نرخەکان بڵندببووەوە هەر لەبەرئەوەش بوو دواجار خۆشی بەرزو بڵندبوو، دەیگوت خوێندنتان لاسوك نەبێ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (طلب العلم فریضه علی کل مسلم)· چێژ لە خوێندنو فێربوون ببینن، هەروەها دەیگوت بۆ پارەو موچە مەخوێنن، خوای گەورە دەفەرمووێت: (وفی السماء رزقکم)·

* دەیگوت لەکاتی پشودا نوێژەکانتان ئەنجام بدەن، چونکە دەروونتان ئارام دەبێت وەك خۆی هەمیشە وابوو·

ئەو ڕێگا ڕۆشنەی ئەوگرتییە بەر گەیاندییە ئامانج، ئێستا سەر بەرزو ڕێزدارو خۆشەویستی هەموانە!!!

پێکەنینو کات بە فیرۆدانەکەی ئێمەش بووە فرمێسكو پەشیمانیو داخوحەسرەت، هیوام وایە چیرۆکی ئێمە پەند بێت بۆ هەموو خوێندکارێك، بە ڕاستی سەرەنجامەکان هەر ئەو دوو جۆرە دەبێت با پێش پەشیمانی بزانین چ ڕێگایەك هەڵدەبژێرین·

# لە یادی (٢) ساڵ تەمەنی پڕشکۆی بڕیاردا

خۆشەویستانی بڕیار، عاشقانی پەیڤی جوانو هەواداران و شەیدایانی پێشکەوتنو گەشەپێدانو ژیارو شارستانییەتو دڵسۆزانی ئەم وڵاتە شیرینە.

دەزانین کە ئێوەی ئازیز بڕیارتان لەلا ئازیزەو لەگەڵ تەمەنی بڕیاردا تەمەنی هیواو ئاواتەکانتان باڵا دەبێتو داری خۆزگەکانتان چرۆ دەکات.

ئێمەش بڕیار بە موڵکی هەموو خوێنەرانی دەزانینو خۆشحاڵین لە دووەم ساڵیادی بڕیاردا، هەر پێشنیارو تێبینییەکانتان هەیە ڕەوانەی گۆڤارەکەی بکەن تا لە ژمارە (٢٤)دا بڵاوی بکەینەوە.

هاوکات هەر پرسیارێکتان هەیەو ئارەزووی دەکەن ئاڕاستەی خاوەن ئیمتیازو سەرنووسەری بکەن، دەتوانن بە ئیمەیڵ یا بە کورتە نامە ئاڕاستەی گۆڤارەکەی بکەن، تا وەڵامتان بدرێتەوە.

بۆ هەر هەستو نەستو چرپەیەکی خۆشەویستیو وەفا بۆ تێپەڕبوونی دووساڵی تەمەنی پڕشکۆی بڕیار ژمارە (٢٤)ی گۆڤاری بڕیار دەرگای واڵایە بۆ هەموو ئازیزانی.

بەشی سێیەم‌و کۆتایی

# سەرچاوەی مرۆیی‌و کۆمەڵگای زانیاری

ئا/ وەهاب حسیب محمد

## بنەماکانی گەشەی مرۆیی

١- شارەزایی و رۆشنبیری: بە یەکێك لە توخمە سەرەکییەکانی فێربون‌و کۆڵەکەیەکی گرنگی شارەزایی دێتە ئەژمار، هۆکارێکی گرنگە بۆ دژایەتی هەژاری و نەفامی‌و توندوتیژی‌و دانانی بەربەستێك لە بەرامبەر کێشە کۆمەڵایەتی‌و رامیارییەکاندا، هاوکات هۆکاری دابینکردنی ئارامی‌و ئاسایشە لە ژیانی رۆژانەدا، بە هۆی فێربونەوە دەتوانین تاك رۆشنبیر بکەین بەو زانیارییانەی باوەڕی پێیەتی تا بتوانێت توانای بیرکردنەوەی دروست‌و دابینکردنی ژیانێکی شایستە بە خۆی هەبێت، لە رێگەی فێربونەوە رووبەڕووی نەفامی‌و ڕەوشتی هەڕەمەکی تاك دەبینەوە، بە شێوەیەك بتوانێت هەڵسەنگاندن لە نێوان کارەکانیدا بکاوچارەسەری گونجاویان بۆدابین بکات· ئەم بۆچونانە زانایانی کۆمەڵناس‌و شارەزایانی بواری گەشەی مرۆیی کۆکن لەسەری·

لەم گۆشە نیگایەوە دەوڵەتان هەوڵی پێشکەوتنی خۆیان‌و هاوڵاتیانیان دەدەن لەرێگای دابینکردنی خوێندن‌و فێربوونەوە بۆ هەموو تاکێکی کۆمەڵگا لە هەموو ئاست‌و تەمەنێکدا· ئەمەش پێویستی بە دابینکردنی هۆکارەکانی (فێربون‌و خۆێندن)ەوە هەیە وەك: دابینکردنی بەشێکی دیاریکراو لە بودجەی ساڵانە، کردنەوەی دایەنگە، قوتابخانە، پەیمانگا، زانکۆو پێداویستییەکانیان لە ئاستی پێداویستی رۆژدا· لەم بوارەشدا وڵاتی ئایسلەندا بە پلەی یەکەم دێت لەجیهاندا بڕی ٨٫١٠٪ی داهاتی ناوخۆی بۆ فێربوون تەرخان دەکات، دەوڵەتی کوێت لە ئاستی وڵاتە عەرەبییەکاندا لە پێشەوەیە بە تەرخان کردنی بڕی ٥٫١٠٪ی لە داهاتی ناوخۆی دابەشکردنی ئەو داهاتە لەم بوارانەدا خەرج دەکرێت، چاودێری منداڵ لە تەمەنی سێ ساڵانەوە دەگرێتەخۆ، تا چوونی بۆ قوتابخانەو دابینکردنی پێداویستییەکانی خوێندنی پاشان هەموو قۆناغەکانی خوێندن‌و پێداویستییەکانی دەگرێتەخۆ وەك: کردنەوەی بینای خوێندن لە هەموو ئاستەکانداو پێگەیاندنی مامۆستایان‌و پسپۆڕان بۆ هەموو ئاستەکانی خوێندن· کردنەوەی خولی جۆراوجۆر بە مەبەستی بەرزکردنەوەی توانای مامۆستایان‌و شارەزایان، دانانی بەرنامەی تایبەت بە بەهرەمەندان، نەهێشتنی جیاوازی نێوان رەگەزی نێرومێ···هتد· سەرەڕای هەموو ئەم پێداویستیانە ئاستەنگەکان زۆرن لە بەردەم پرۆسەی فێربووندا بە نموونە جیهان تا ساڵی ٢٠٢٥ پێویستی بە ١٨ ملێون مامۆستا هەیە لە بواری خوێندنی سەرەتاییدا· چونکە تائێستا ١/٥ی دانیشتوانی جیهان نەخوێندەوارن·

٢- گرنگی تەکنەلۆژیای زانیاری‌و هۆکارەکانی گەیاندن لە پێشخستنی گەشەی مرۆیی‌و کۆمەڵگای مەعریفەدا تەکنەلۆژیای زانیاری رۆڵێکی دیار دەگێڕێت لە باشکردنی گەشەی مرۆیی‌و کۆمەڵگای مەعریفەدا (بیل گیتس) سەرۆکی ئەنجومەنی ئیدارەی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت) پێشبینی دەکات کەرتی تەکنەلۆژیا لە وڵاتە عەرەبییەکاندا لە ماوەی نێوان (٢٠٠٨ - ٢٠١٢ )، ٢١٠ ··· هەلی کار فەراهەم بکات، ئەمەش هۆکارێکی باشە بۆ گەشەی ئابوری ناوچەکە، سەرەڕای دامەزراندنی (٤٠٠) کۆمپانیای تایبەت لەو بوارەدا· ئەمەش کەسێکی وەك کریغ بارێت سەرۆکی کۆمپانیای ئەنتڵ دێنێتە سەرئەو باوەڕەی بڵێ ئێمە لە جیهانێکی بەردەوامداین، بنیات نراوە لەسەر شارەزایی کە بناغەیەکە بۆ ئابوری جیهان‌و بازاڕەکانی· کارێکی بەڵگە نەویستە لە دنیای ئەمڕۆدا گواستنەوەی زانیاری لە وڵاتە پێشکەوتوەکانەوە بۆ وڵاتانی تازە وەخۆکەوتوو ئاسانترە لە گواستنەوەی کشتوکاڵ لێرەوە، گواستنەوەی زانیاری، هاندانی فێربوون، دۆزینەوەو پێگەیاندنی بەهرەمەندان، دروستکردنی کۆمپانیای بچوك کە پشت بە دروستکردنی زانیاری دەبەستێت بە هۆکارێکی پێشکەوتنی ناوچەکە دەبینرێت، سەرەڕای چاکسازی لە دەسەڵاتو بەڕێوەبردندا لە وڵاتە تازە گەشەسەندووەکاندا بە پێشەنگی کارەکان دێتە ئەژمارو هۆکاری سەرەکی پێشکەوتنن·

ئیسرائیل وەك نموونەیەك لە گرنگیدان بە بنەماکانی گەشەپێدانی مرۆیی:

١- (خوێندن لە وڵاتی ئیسرائیل): فێربوون لەم وڵاتەدا لە تەمەنێکی بەراییەوە دەست پێدەکات، هەلێکیش دەرەخسێنێت بۆئەوەی تواناکانی منداڵ گەشە بکاتو دەربکەوێت بە تایبەت لە بوارەکانی زمان‌و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا، لەم قۆناغەدا منداڵ دەخرێتە چەندین چوارچێوەی فێربوونەوە بە سەرپەرشتی ناوەندەکانی چاودێری، کە لە لایەن رێکخراوەکانی ژنان یاخود باخچەی ساوایانی تایبەتییەوە بەڕێوە دەبرێن، ئەم قۆناغە لە تەمەنی پێنج ساڵانەوە دەست پێدەکاتو بە ناچاری تیایدا منداڵ فێری بنەماکانی زمان‌و بیرکاری دەکرێت· پاشان قۆناغەکانی سەرەتایی، ناوەندی، دواناوەندی دەست پێدەکات، ئەم قۆناغانە خوێندن تیایدا بە خۆڕاییەو هاوکات بە زۆرە (بە پێی یاسا نەك بە زۆری هێز)، قوتابخانەکانی ئەم وڵاتە لە لایەن وەزارەتی پەروەردەوە ئازادی تەواویان پێدراوە، ساڵانە لە قوتابخانەکانی ئەم وڵاتەدا باسێکی بە بایەخ لە بواری نەتەوایەتیدا هەڵدەبژێردرێت، لێکۆڵینەوەی قوڵی لەسەر دەکرێت بە مەبەستی فراوانکردنی بازنەی هەست‌و هۆشی نەتەوەیی قوتابیان· پێداویستییەکانی خوێندن لە ٨٠٪ی لە

لایەن حکومەتو دەسەڵاتە ناوچەییەکانەوە دابین دەکرێت. لەساڵی ١٩٩٣ەوە ئیسرائیل لە هەوڵی بەردەوامدایە بۆ دابینکردنی کۆمپیوتەر بۆ هەرقوتابییەك هەر لە قۆناغی باخچەی ساوایانەوە تا قۆناغی دواناوەندی، لە چوارچێوەی پرۆسەیەکی چڕو هەمەلایەنەدا کە زانستوفێربون بە کۆڵەکەی کۆمەڵو بناغەی خوێندنی باڵا دەبینێت. لە زووەوە عیبرییەکان هەستیان بەوە کردبوو کە ئاسایشی دەوڵەتەکەیان وەستاوە لەسەر هێزی زانیاریو زانست، ساڵی ١٨١٩ کاتێك (کۆمەڵەی زانستو رۆشنبیری ئیسرائیلی) دامەزرا بە مەبەستی هەڵبژاردنی مامۆستایان، گۆڕینەوەی بیروراو دانانی پلان بە مەبەستی بە هێزکردنی زانستو زانیاری بوو لە وڵاتی فەلەستین، لێکۆڵینەوەی کشتوکاڵی لە بەرایی هەوڵەکان بوون کە قوتابخانەی (میکفی ئیسرائیلی) لێکەوتەوە، لایەنەکانی تەندروستی، زانست... هتد، کەمتر نەبوو لە کەرتی کشتوکاڵ، لە رووی گرنگی پێدانەوە، بە نموونە وێستگەی تەندروستی عیبری پێش جەنگی جیهانی یەکەم دروست بوو لە ناوەڕاستی بیستەکانی چەرخی رابردوودا پێشکەوتنی بەرچاوی بە دەست هێنا کاتێك پەیمانگای میکرۆبیۆلۆجی وبەشەکانی بیۆکیمیاو زانستی میکرۆب ناسی...هتد تیادا کرایەوە. سەرەڕای داڕشتنی چەندین پرۆژە بە مەبەستی بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگا وەك (پرۆژەی ئۆرت) ماوەکەی پەنجا ساڵ بوو پاش دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل لەساڵی ١٩٤٨ەوە داڕێژراوە، ئامانجی دروستکردنی پەیوەندی هەمیشەییو بەردەوامە لە نێوان زانستو بازاڕداو هاوکاری بازاڕ بە هێزی کاری شارەزا، ئەم پرۆژەیە لەسەر چوار کۆڵەکە وەستاوە بریتین لە:

أ- خاوەن پیشەکان. ب- جوتیارە گەنجەکان. ج- بێکارەکان. د- ئەو قوتابیانەی ماونەتەوە... چەندین پرۆژەی تر...

٢. زانکۆ لە وڵاتی ئیسرائیلدا: پێشخستنی زانیاری یەکێك لە گرنگترین ئامانجەکانی مامۆستایە لە زانکۆکانی ئیسرائیلدا ٢٢٠٠ کەس لەو بوارەدا کاردەکەن سەرەڕای کاری سەرەکیان کە مامۆستایەتییە لە زانکۆکاندا، بڵاوکراوەی ئەو دەستگاو مامۆستایانە باشترین گەواهین، بڵاوکراوە زانستییەکانی وڵاتی عیبری ١٪ی کۆی بڵاوکراوەکانی جیهان لەو بوارەدا پێك دەهێنن. زانا ئیسرائیلییەکان سەرچاوەی زۆرێك لە زانستەکانن لە جیهاندا وەك: کیمیا ...هتد، بڵاوکراوەی شارەزا ئیسرائیلییەکان لە بوارەکانی: ئەندازیاری، کشتوکاڵ، پزیشکی...هتد، ژمارەیان بەرچاوەو بڵاوکراوەکانیان بە بەشداری شارەزایانی وڵاتانی تر زیاترە.

لە پێناو تێکەڵاوکردنی چالاکی زانستی وڵاتی عیبری لەگەڵ چالاکی کۆمەڵگای جیهانیدا ناوەندە زانستییەکانی ئەو وڵاتە هەڵگرانی خاوەن بڕوانامەی دکتۆرا هاندەدەن کە هەر حەوت ساڵ جارێك ساڵێك وەك پشوو لە دەرەوە بگوزەرێنن، بە مەبەستی توێژینەوەو بەشداری کۆڕو کۆمەڵە زانستییەکان لە جیهاندا.

وڵاتی ئیسرائیل بە ناوەندێکی گرنگی کۆڕو کۆبونەوە زانستییەکانی جیهان دێتە ئەژمارو ساڵانە میوانداری چەندین کۆڕو کۆبونەوەو لێدوان لەو بوارەدا دەکات، زانکۆکان پاڵپشتێکی بەهێزی وڵاتن لە بەرەو پێشچونی زانستو تەکنەلۆژیادا، پەیمانگای (فایتسمانی زانستی) سودێکی زۆری بە وڵات گەیاندووە لە بواری بازرگانیدا، (پەیمانگای فیتسمان) بە یەکێك لە پەیمانگا رەسەنەکان دەژمێردرێت لە جیهاندا دامەزراوە بە مەبەستی سود وەرگرتن لە توێژینەوەکانی زانکۆ، دامەزراوە زانستییەکانی ئیسرائیل زیاتر لە ١٥٠ رێکەوتننامەی زانستییان لەگەڵ زانکۆو دامەزراوە رەسەنەکانی جیهاندا واژۆکردووە. قوتابیانی زانکۆکانی ئەو وڵاتە تەمەنی ٢١ ساڵی دەگوزەرێنن پاش ئەوەی ٢ ساڵ بۆکیژان، ٣ساڵ بۆ کوڕان خزمەتی سەربازی تەواو دەکەن، پەیوەندی بە زانکۆوە دەکەن، ئەوانەی توانای زانستییان لاوازە خولی بەهێزکردنیان بۆ دەکرێتەوە لەو بوارەداو پاشان لە خوێندنی باڵا وەردەگیرێن، ئێستا گەنجانی زانکۆکانی ئەو وڵاتە ٥٠٪یان لە تەمەنی (٢٠بۆ٢٤) ساڵیدان. لەچەندین زانکۆی ئەو وڵاتەدا خوێندن تەواو دەکەن، وەك: زانکۆی عیبری لە قودس ساڵی ١٩٢٥ دامەزراوە، زانکۆی بارئیلان ساڵی ١٩٥٥، زانکۆی تەلئەبیب ساڵی ١٩٥٦، زانکۆی حەیفا ساڵی ١٩٦٣، زانکۆی بن غۆریۆن ساڵی ١٩٦٧ەوە زانکۆی کراوە یاخود زانکۆی هەموو کەس... هتد. کە هەر یەکێکیان چەندین بواری گرتۆتە خۆو رۆڵی دیارو کاریگەر دەگێڕن لە پێشخستنی دەوڵەتو کۆمەڵگای ئیسرائیلیدا.

٣- زانستو لێکۆڵینەوەی زانستی لە ئیسرائیلدا: ساڵی ١٩٥٥ (بن غۆریۆن) دامەزرێنەرو یەکەم سەرۆکی ئەو وڵاتە لە بەردەم کەنیستی جولەکەدا ستراتیژییەتی زانستو زانیاری بەم شێوەیە دیاری کرد: ئاسایشی دەوڵەتی ئیسرائیل بە تەنها ناوەستێتە سەر سوپاو چەك ئەگەر چی بێ ئەوانە ئاسایش بوونی نییە، ئاسایشی ئیسرائیل واتە: کۆچو نیشتەجێکردن (زەویو مرۆڤ) ئاسایش واتە توانای زانستیو پێشخستنی لێکۆڵینەوەی زانستی. ئەوەش لە تواناو پێشکەوتنی توانای هونەری لاوەکاندا دەردەکەوێت لە بوارەکانی: پیشەسازی، کشتوکاڵ، ئاوەدانکردنەوە... هتد. لەم روانگەیەوە کاری زانست لەم وڵاتەدا دیاریکراوە بریتییە: لە چەکێك بە مەبەستی پاراستنی دەوڵەتو پێشکەوتنی ئابوری، لێرەوە دەتوانین ژمارەی دەزگا زانستی، رۆشنبیری، پەروەردەو فێرکارییەکانی ئەو وڵاتە دەستنیشان بکەین کە دە گاتە (٥٠٠٠) دەزگا، هەموو بوارێکی گرتۆتە خۆ وەك ئەدەب، وەرزش، مۆسیقا، ماف، ئابوری، کیمیا، هێزی ناوکی، زانستی جیناتەکان، زانستی نانۆ، لێکۆڵینەوە لە بوارەکانی پیشەسازی، کشتوکاڵ، لێکۆڵینەوەی سەربازی... هتد. ئیسرائیل لە سەرەتای دامەزراندنییەوە لە هەوڵی دروستکردنی زەمینەیەکی گونجاودا بووە بۆئەوەی بتوانێت مەرامە زانستییەکانی جێبەجێ بکات ئەنجامەکەی بریتی بێت لە دەوڵەتێکی بەهێزو ئارام، لەم پێناوەشدا چەندین یاساو پلانی دەرکردووەو داڕشتووە، دەزگاو دەستەی زانستی دامەزراندووە، رێکەوتننامەی زانستی لەگەڵ زۆرێك لە وڵاتانو ناوەندە زانستییەکان لە جیهاندا مۆرکردووە وڵاتەیەکگرتووەکان پێشەنگی ئەو وڵاتانەن. ملێونەهای لەو پێناوەدا خەرج کردووە بە تایبەتی پاش گەرانەوەی زانا یەهودییەکان بەخشینی جۆرەها ئیغرای مادیو مەعنەوی پێیان... دەوڵەتی ئیسرائیل چەندین یاسای دەرکردووە بە مەبەستی دروستکردنی ژینگەیەکی یاسای پارمەتیدەری زانستو خوێندنی باڵا بێتو پاڵشتی دۆزینەوەو داهێنان بکات. لەوانە یاسای (أورت): کە ئامانجی دروستکردنی پارمەتییە لە نێوان کەرتی کارو زانکۆکاندا، دانانی پلانی دوورمەودا بە مەبەستی پێشخستنی زانستو زانیاری لە هەموو بوارەکاندا...هتد. ئەمانەش ساڵانە (٢٧،٥ملیارشیکل)ی بۆ خەرج دەکرێت دەکاتە ٤،٦٪ داهاتی ناوخۆ جیا لە خەرجی لێکۆڵینەوە لە بواری سەربازیدا. ئەنجامی ئەم هەوڵانەش گەشەسەندنی ئابورییە لەو وڵاتەدا بە رێژەی ١،٤٪ ساڵانە داهاتی تاك ٣٣٨٩٠$، دەوڵەتی ئیسرائیل لە پیشەسازی ئەلماسدا توانیویەتی پلەی یەکەم بە دەست بهێنێت، هەر لە دروستکردن، دەرهێنان، بازرگانیکردن، بەم کانزا گرانبەهایەوە لە کاتێکدا خاکی ئەو وڵاتە کانزایی تیادا نییە. ساڵی ٢٠٠٦ داهاتی ئیسرائیل ١٦٠ملیار$بووە. سەرەڕای پێشکەوتنی لە لایەنی تەکنەلۆژیاو هێزی ناوکی... هتد. ئەگەر هەندێ لە شارەزایان پێیان وایە زیندوکردنەوەی زمانی عیبری پاش ساڵی ٢٠٠٠ لە پەرتەوازەیی و ئاوارەیی کەمتر نییە لە هەموو ئەم داهێنانانە. ئێستا زمانی فەرمی وڵاتەو لە هەموو بوارێکدا بەکاردەهێنرێت.

سەرچاوە/ ١- التنمیه البشریه والمجتمع المعرفه/ عبدالحسن الحسینی.
٢- التعلیم العلمی والتکنلوجی فی اسرائیل د. صفا عبرالعالی.

# خۆشییە کاتییەکانی دونیا...

ئا/ بێکەرد فارس

چیرۆکی مامۆستاکەو سەرنشینانی شەمەنەفەرەکەت بیستووە؟؟

ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە لە ناو یەکێك لە شەمەنەفەرەکاندا ڕووی داوە...

ڕۆژێـك لە ڕۆژەکان زەنگی تایبەت بە کاتی ڕۆیشتن لێدرا... هەموو سەرنشینەکان چوونە نێو شـەمەنەفەرەکە، مامۆسـتای بەڕێز کەمێك دواکەوت، بەڵام خۆشبەختانە ئەویش فریای شەمەنەفەرەکە کەوت، کاتێ چووە نـاو شـەمەنەفەرەکە بینی هەموو سەرنشـینەکان جێـی خۆیـان گرتـووەو شوێنێك نییە بۆ ئەم تیایدا دابنیشێت..

ڕووی کـردە بەشـی یەکەمـی شەمەنەفەرەکە کۆمەڵێك منداڵی تێدا بوو پێکـەوە یارییان دەکرد، سـڵاوی لێکردنو پرسـی: ئایـا جێگـەم دەبێـت لەگەڵتان دابنیشـم؟ ئەوانیـش زۆر ڕێزیان لێگرتو بە دیتنی خۆشـحاڵ بوون، وتیان لەسـەر سەروچاوان داتدەنێین، بەڵام ئێمە منداڵین یـاری دەکەینو خۆشـی بەسـەر دەبەین دەترسـین بێزارت بکەینو حەوانەوەت لێ تێـك بدەین، بوونت لەگـەڵ ئێمە دەبێتە هـۆی ئـەوەی ئازادیمان لـێ تێك بچێتو ئاسووده نەبین...

چووە بەشـی دووەمی شەمەنەفەرەکە سێ لاوی تێدا بوو کە دیار بوو خوێندکار بـوون... ئامێـری ژمێـرەرو ڕاسـتەیان پێ بـوو.. لەوپەڕی سـەرقاڵیدا بوون بە شـیکاری هاوکێشـەو گفتوگۆکردن لەسەر بیردۆزە فیزیاییەکان... سڵاوی لێکردن... بریا ڕووی گەشـاوەی ئەوانـت دیبا کاتێ چاویان بە ڕووی درەوشـاوەی مامۆستاکە کـەوت، بەخێرهاتنیان کردو خۆشـحاڵی خۆیان بەبینینی دەربڕی... لێی پرسین: ڕێگەم دەدەن لەگەڵتان دابنیشم؟!

وەڵامیان دایەوە: زۆر خۆشحاڵ دەبین، بەڵام دەبینیت ئێمە سەرقاڵین بە شیکاری پرسیارو هاوکێشەوە، هەندێ کات دەنگمان بـەرز دەکەینـەوەو تـۆ بێزاردەکەیـنو ناتوانیت لای ئێمە بحەوێیتەوە، دەترسین کە بوونی تۆ لەگەڵ ئێمە ڕێ لە ئازادیمان بگرێـتو ئاسـووده نەبین لـەم دەرفەتی خۆئامادەکردنمـان بـۆ تاقیکردنەوەکانی کۆتایی سـاڵ. دەتوانیت بچیتە بەشەکەی دوای ئێمـەوە شـوێنێك بۆخـۆت بکەیتەوە...

مامۆسـتاکە وتی: پەنا بەخواو ڕووی کردە بەشی دواوەی گەنجەکان...

لەوێشـدا ژنو مێردێکـی لاو کـە دیاربـوو لـە مانگـی هەنگوینیـدا بن... وشـە ڕۆمانسـییەکانو پێکەنینو هەستی سۆزوخۆشەویستی لەو شوێنەدا هەستی پێ دەکرا، سڵاوی لێکردن، ئەوانیش بەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستییەوە بەخێرهاتنیان کرد بە هەمان جارەکانی پێشوو داوای یارمەتی کرد، لە وەڵامدا وتیان گەورەو خۆشحاڵمان دەکەیـت... بـەڵام وەك دەبینیـت ئێمە تازە هاوسـەرگیریمان کردووەو لە مانگی هەنگوینیداییـن، کەشـێکی ڕۆمانسـیو گەنجانەمان هەیە دەترسـین ئارامیت لێ بشێوێنینو ئاسـوده نەبیت لەگەڵمان، بە بوونت لەگەڵمانـدا ئازادیمان تێك دەدات، چونکە شـەرم دەکەین لەوەی گوێبیسـتی چرپەکانمـان بیـتو ناتوانیـن کاتمـان بەخۆشی بەسەر بەرین.

دەتوانیـت لـە بەشـی دواوەی ئێمەدا جـێ بۆ خـۆت بکەیتـەوە، بێگومـان بە خۆشحاڵییەوە پێشوازیت لێ دەکەن.

ئاە... ناچار دەبم بچمە بەشـێکی تر ڕوخسەت وەربگرم...

لەو بەشـەدا دوو کەس کە لە کۆتایی تەمەنی سییەکاندا بوون چەندین نەخشەی زەویو پرۆژەکانیان پێبوو، بیروڕای خۆیان دەربـارەی پلانی داهاتوویـان دەگۆڕییەوە بۆ فراوانکردنی بازرگانیو نرخو بۆرسـەو تیشکە ئابورییەکانیان...

بەرێزەوە سـڵاوی لێکردن.. ئەوانیش بە ڕوویەکی گەشـەوە وەڵامی سڵاوەکەیان دایـەوەو بەخێرهاتنیـان کـرد، مۆڵەتی لـێ وەرگرتن کـە لەگەڵیـان بمێنێتەوەو بەشـداری دانیشـتنەکەیان بـکات، بەڵام هەمـان وەڵامەکانـی تـری وەرگرتـەوە: زۆر پێمـان خۆشـە بەرێزتـان لەگەڵمان بنو خۆشـحاڵ دەبین، بـەڵام... ئاە.. لە وشـەی بەڵام هەموو ئـەوەی پێش خۆی دەسـڕێتەوە... دەبینیت ئێمە لەسەرەتای بازرگانیو داڕشـتنی بیرۆکەکانمانداین بۆ بەدەست هێنانی پارەو سـامانو هاتنەدی ئـەو خەونانـەی لـە پرۆژەکانمانداییە... هەموو قسـەو باسێکمان لەسەر بازرگانیو ماڵو سامانە دەترسین بەوە بێزارت بکەینو ناڕەحەت بیت... باش وایە بچیتە بەشـی دوواوە تا بەبێ بێزارکردن بحەوێیتەوە.

بەو شـێوەیە بوو تا گەیشـتە کۆتایی بەشـی شـەمەنەفەرەکە.. خێزانێـك لەوێـدا بوون کـە پێکهاتبـوون لە دایكو باوكو منداڵەکانیان... لەو بەشـەدا هیچ جێگەیەك بۆ دانیشـتن نەمابوو... سڵاوی لێکـردن ئەوانیـش بەجوانتریـن شـێوە وەڵامیـان دایـەوەو بەخێرهاتنیـان کرد، پێـش ئەوەی مۆڵەتی دانیشـتن وەربگرێ داوایان لێکرد کە هاوبەشی دانیشتنەکەیان بکاتو لەگەڵیان بمێنێتەوە، محمد هەستە لە باوەشی براکەت دابنیشە، سارا تۆ وەرە لە باوەشـی دایە دابنیشـە، ئەو جانتایانە

کۆبکەرەوەو ڕێگە بۆ میوانە بەڕێزەکەمان بکەنەوە... مامۆستاکە سوپاسی کردنو لەسەر یەکێ لە کورسییەکان دانیشت پاش ئەوەی ماندوو بوو لە گەڕان بە دوای جێگەیەك بۆ حەوانەوە...

لە یەکێك لە وێستگەکاندا شەمەنەفەرەکە وەستا...

فرۆشیارێکی خواردنی ئامادەکراو سەرکەوت، مامۆستاکە بانگی کرد، داوای لە خێزانەکە کرد هەریەکەو بە دڵی خۆی خواردنێك هەڵبژێرێت، هەموو سەرنشینەکان چاویان لەسەریان بوو خۆزگەیان دەخواست کە مامۆستاکە لای ئەوان بوایە...

بە پەرۆشەوە بوون کە ڕێگەیان بدایە لایان بمێنێتەوە...

پاشان شەربەت فرۆشێك سەرکەوت داوای لەویش کرد هەر جۆرێك کە خێزانەکە لەو شەربەتەی دەیانەوێ بیانداتێ لەسەر حسابی خۆی...

ئەی خوایە چاوی سەرنشینەکان تەنها لەسەر خێزانەکە بوو... ئاواتیان دەخواست مامۆستاکە لایان بوایە بەڵام پاش چی...

ڕۆژنامەو گۆڤار فرۆشێك دوای ئەوان سەرکەوت بە هەمان شێوە داوای لەویش کرد بێتە لای خێزانەکەو هەرکەسەو بە دڵی خۆی یەکێکی هەڵگرتو منداڵەکانیشیان بێبەش نەبوون لە وەرگرتنی گۆڤاری منداڵان...

سەرنشینەکان بەردەوام بوون لە ئاهو حەسرەتی ئەوەی جێی ئەو پیاوە پیرەیان بۆ نەکردەوە؟!

هەموو گەیشتنە شوێنی مەبەستو شەمەنەفەرەکە وەستا لەو کاتەدا سەرنشینەکان سەرسام بوون بەوەی کە لە دەرەوە چەندین پۆلیسو ڕازاندنەوەی شوێنەکەو گوڵو گوڵزارو وێستگەکەیان ڕازاندبووەوە... لەو کاتەدا ئەفسەرێکی پلە بەرز سەرکەوتو داوای لە هەمووان کرد کە سەرنشینەکان لە جێی خۆیان بمێننەوە تا میوانی پاشای ئەو وڵاتە لە شەمەنەفەرەکە دادەبەزێت، لەبەرئەوەی خودی پاشا هاتۆتە پێشوازی میوانەکەی...

دەبێت ئەو میوانە بەڕێزە کێ بێت کە شای ئەو وڵاتە دێتە پێشوازی؟!

ئەو میوانە هەر ئەو مامۆستایە بوو کە سەرنشینەکان لەبەر بەرژەوەندی خۆشی خۆیان ئامادە نەبوون لەگەڵیان بێت!!

کاتێك داوایان لێکرد دابەزێت ڕەتی کردەوە کە تەنهاو بێ ئەو خێزانە دابەزێت کە ڕێزیان لێگرتو لای خۆیان جێیان بۆ کردەوە!!

پاشای ئەو وڵاتە ڕەزامەندی بۆ هاوڕێی کردنی خێزانەکە لەگەڵی نواند کە میوانداری ئەوانیش لە کۆشکی پاشایەتی خۆیدا بکات، لەو ماوەیەدا بۆیان هەیە خۆشی خۆیان بەسەربەرنو هەرشتێك ئارەزوویان هەیە داوای بکەنو لە باخو باخچەکانی کۆشکەکە بگەڕێنو دیمەنە جوانەکانی ببینن!!

لێرەدا سەرنشینەکان زیاتر پەشیمانیو حەسرەتیان دەربڕیو چ هەلێکیان لە دەست چوو لە کاتێکدا خۆی چووە بەردەمیانو قبوڵیان نەدەکرد... بەڵام پەشیمانی چ دادێك دەدات...

بەسەرهاتەکانی ئەم چیرۆکە تایبەتە بە هەموو یەکێك لە ئێمە! من... تۆ... ئەو... سات بە سات تیایدا ژیاوین!!

ئێستە پاش ئەوەی ڕووداوەکانتان بینی پێم خۆشە بپرسم: ئەو مامۆستایە کێ بوو؟؟

بۆچی دەڵێم ئەم چیرۆکە تایبەتە بە هەموو کەسێك لە ئێمەو سات بەسات تێیدا گوزەرمان کردووە؟!!

ئەو مامۆستایە بریتییە لە (دین)...

ئاە لە جوانیو گەورەیی ئاین... بەڵام ئێوە جارێ منداڵن پێویستە کاتەکانتان بۆ یاری کردنو خۆشیو ڕابواردن بێت، چونکە تەمەنێکی زۆرتان لە بەردەمدایە بۆ پابەندبوونو کارپێکردنی...

ئای پابەندبوون بە ئاین چەندە گەورەو باشە... بەڵام جارێ ئێوە قوتابین سەرقاڵی خوێندنن... کاتێ خوێندنتان تەواو کرد پابەند بن پێوەی...

یان جارێ لە مانگی هەنگوینی دان، یان چاوەڕێی بەرهەمو دەستکەوتی بازرگانین... کات زۆر ماوە بۆ پابەند بوون...

بەڵام نازانین ئایا ئەو کاتە دێت کە بۆ داهاتوومان چاوەڕێی دەکەین؟؟

ئایا ئەو کاتە زیندووین یان مردوو؟!!

دواخستنو کەمتەرخەمیکردنو وتنەوەی... بەیانی ئەنجامی دەدەم... بەڵام با لەم کارەم تەواو بم... جارێ منداڵم کە گەورەبووم ئەنجامی دەدەم... دوای ئەوەی هاوسەرگیریم کرد پابەند دەبم... پاش تەواوکردنی زانکۆ... پاش کارگرتنە دەست... پاشو پاش...

بەڵام لەوانەیە تا ئەو کاتە کار لەکار ترازابێتو نەتوانین لەهیچ دەروازەیەکەوە خۆمان قوتار بکەین... کەواتە هەر ئێستە پابەندبە تا پەشیمانی یەخەت نەگرێ...

سەرچاوە: ئینتەرنێت

# وەڵامەکانی حەکیمێك

و/ سەردار صالح محمد

ڕۆیشتم بۆ لای حەکیمێك بۆ ئەوەی لێی بپرسم، پێویستە مرۆڤەکان فێری چی بین؟!

وەڵامی دایەوە: پێویستە مرۆڤەکان فێرببن کە مرۆڤی دەوڵەمەند ئەو کەسە نییە کە زۆری هەبێت، بەڵکو ئەوەیە کە کەمی پێویست بێ!

هەروەها پێویستە فێری لێبوردن بین، فێربن کە... لێبوردن تاقی بکەنەوە.

فێربن کە... ناتوانن بە زۆر خۆشەویستی خەڵکی بە دەست بهێنن... بەڵکو ئەوە کردارەکانیانە خۆشەویستییان دەخاتە دڵی خەڵکەوە.

فێربن کە... بەراوردی خۆیان نەکەن لەگەڵ لە خۆیان بەرزتر!

فێربن کە... دەتوانن لە چەند چرکەیەکدا دڵی خۆشەویستەکانیان بریندار بکەنو فرمێسك بکەنە میوانی چاوەکانیان،

بەڵام چەندین ساڵیان پێویستە بۆ سارێژ کردنەوەی ئەو برینە!

فێربن کە ... کەسانێك ئەوانی زۆرخۆش دەوێ، بەڵام نازانن چۆن تەعبیر لەو خۆشەویستییە بکەن!

فێربن کە... ئەگەرێ دووکەس سەرنجی یەك شت بدەن، بەڵام تێڕوانینی جیاوازیان بۆی هەبێت!

فێربن کە... تەنها ئەوەندە بەس نییە لە یەکتر ببورن، بەڵکو دەبێت بەرامبەر دەروونی خۆشیان لێبوردە بن!

بە هیوای ژیانێکی بەختەوەر، تەندروست، منداڵی، لێبوردەیی، دەوڵەمەندی، خۆشەویستی!

سەرچاوە: ئینتەرنێت

سەرنجی ئەم وێنەیە بدەو بە دیدو خەیاڵی تیژو

هەستی ناسکت بۆی بنوارەو پاشان خامەکەت

هەڵبگرەو گوزارش لەو هەستە ناسکو خەیاڵە

وردو سۆزە بێ سنوورەت بکە، تا ببیتە خاوەنی

یەکێک لەم دوو خەڵاتەی خوارەوە:

- بەشداری بێ بەرامبەری ساڵێکی گۆڤاری بڕیار.

- بەشداری بێ بەرامبەری شەش مانگی

گۆڤاری بڕیار.

دوا مۆڵەتیش بۆ وەرگرتنی وەڵامەکان

(١٠) ڕۆژ دوای دەرچوونی گۆڤارەکەیە.

**خەلاتی یەکەم**
**شارۆ ئەحمەد**

دوو نیگا
چەند جودان لە یەکتر
چەند دوورن
یەکێکیان چەند روونەو
ئەوی تر چەند لیخن
نیگایەك بێگەردە
وەك نیگای فریشتە
پڕ میهرو جوانییە
شادی مەبەستە
نیگایەك توڕیە هەمیشە
بە ئاشتی زۆر پەستە
یەکەمیان چاوانی چەند گەشە
دووەمیان لاپەڕەی رەفتاری هێند ڕەشە
خود پەسەند، خۆپەرست، دڵا رەشە
بە تەنها دەزانێ
زمانی چڕنوكو لێدانو هەڕەشە !
جیاوازی ئەم نیگاو ئەو نیگا
ئاسمانو ڕێسمانە
یەکەمیان
وەکو ئاو
بۆ ئێمەو بۆ هەموو
ژیانە
دووەمیان ستەمو دۆزەخو
تاوانە !

به وردی لەم وێنەیە ورد بەرەوەو

هێزی مێشکو بیرکردنەوەت بخەرەکار،

بزانە چی دەبینیت؟

تا چ رادەیەک دیدی تێڕوانینت وردە؟

سوپاس بۆ ئەو بەڕێزانەی کە لە خوارەوە ناویان هاتووە. بە شیعر یاخود پەخشان بابەتیان ناردووە بۆ ئاسۆی ژمارە (٢١)

١-هێرش خدر
٢-زوهره خەسرەو
٣-سابیر حەمە ڕەحیم
٤-میرشاد ماوەتی
٥-شادمان عومەر
٦-سەردار عەبدوڵلا
٧-دایکی نیگا
٨-بابان کەلاری
٩-کامەران حەمە سەعید

**خەڵاتی دووەم**
**ڕێبوار عەبدوڵا**

هەر دووك
دەڕوانن
بۆ منی ماسی
لە نێو حەوزێکی بچکۆلانەدا
دیلو ئەسیرم
زۆر بە کەساسی
تۆی مرۆڤ هێشتا سادەو منداڵی
جیهانی فێڵو تەڵەکەبازی
زۆرباش ناناسی
وەڵێ بەبە گیان
ئەوەی تەنیشتت
گورپەی سمێڵ فش
دووچاوی پڕە
لە خیانەتو سپڵەییو پیلان
خۆزگە دەمتوانی من بێمە زمان
هاوارکەم بڵێم:
ئەرێ بێ ویژدان
چاوەڕێی چیتە
تۆ چیت گەرەکە
لە منی بەسەزمان
هەموو ئاواتو خۆزگەی ژیانت
هەر چڵێسییەو ناپاکیو تاوان
بۆ وازناهێنی
بۆچی هەمیشە
وەکو تارمایی هەورێکی رەشی
تاڵ دەکەی ژیان ؟!

## خێزانی بەختەوەر

# بمبوورە من هەڵە بووم!

**پیاوانی ڕۆژئاوا جیاوازن لەگەڵ ڕۆژهەڵاتدا لەدەربڕینی لێبووردندا!**

**گەر دەتەوێت بۆ ماوەیەکی کەم بژیت ئاوا بەردەوام لە تۆڵە سەندنەوەدا بە!**

**گەر دەتەوێت بۆماوەیەکی زۆرو بەخۆشبەختی بژیت، ئەوا لەهەموو کەس خۆشبە!**

**لێبوردن، هەڵدانەوەی پەڕەیەکی نوێ لە ژیانماندا!**

بە سەربردنی ژیانی هاوسەرێتی بێگومان بەبێ هەڵەو کێشە نابێت، چونکە دوو کەسی جیاواز کە پێشتر لە نێو دووخێزانی جیاوازدا پەروەردە بوونو ئێستا لەژێر سەقفی ماڵێکی نوێدا کۆبوونەتەوە، ڕەنگە بۆ ماوەیەکی زۆر نەتوانن تەواو شارەزاببن لە هەڵسوکەوتی یەکتری، لەوانەیە زوو زوو بە وتەو هەڵسوکەوتی یەکتری زیز ببن، بەڵام ئەگەر هەردوولا لێبووردن بکەنە پیشەیان ئەوا دەتوانن ژیانێکی خۆش بەسەر بەرن.

بێگومان هیچ کەسێك بێ هەڵە نییە، هەروەك پێغەمبەر (د-خ) دەفەرمووێت: (هەموو ئادەمیزادێك هەڵە دەکات، باشترینیان ئەوانەن کە داوای لێبووردن دەکەن). بە تایبەتی لە ژیانی هاوسەریدا هەڵە دروستیان دەکات، کاتێك زیزبونێك لە نێوانیاندا دروست دەبێت دوای لێبوردنو ئاشتبوونەوە خۆشەویستی لە نێوانیاندا زیاتر دەبێت، پێویستە لەسەر هەردوولا لە کاتی ڕوودانی هەر کێشەیەکدا دوور بن لە کەللەڕەقی، چونکە زۆر جار ئەوەی کێشەکە ئاڵۆزتر دەکات ئەوەیە لایەکیان دەزانێت کە هەڵەیە، بەڵام سوورە لەسەر هەڵەکەی خۆیو دانی پێدا نانێتو وا دەزانێت ئەگەر داوای لێبووردن بکات مایەی شەرمەو بە سووکی تەماشا دەکرێت، بەڵام بە پێچەوانەوە بەهێزو ئازا ئەو کەسەیە دەستپێشخەری دەکات لە لێبوردندا.

دواخستنی وتەی لێبووردن کاردانەوەیەکی خراپی دەبێت بۆ داهاتووی ژیانی هاوسەریتانو دەبێتە برینێکی قوڵو لە ڕوودانی هەر کێشەیەکی تردا برینەکەی تازە دەبێتەوە هەمان وتەو ڕەفتاری ڕابووردووی دێتەوە یاد.

بۆیە دەڵێین لێبووردن کارێکی پێویستە بۆ بەردەوام بە سەربردنی ژیانێکی پاكو بێگەردو دوور لە هەموو ڕقو کینەیەكو کردنەوەی دەرگای سۆزو بەزەیی لە نێوان یەکتریداو بەخشینی ژیانێکی نوێ بە هەردوولا.

سەبارەت بە هەڵوێستی کەسەکان سەبارەت بە داوای لێبووردن، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی ترو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی ترجیاوازن.

بۆ نموونە: دەرکەوتووە پیاوانی ڕۆژهەڵاتی جیاوازن لە پیاوانی ڕۆژئاوا، واتە: ڕۆژهەڵاتی لێبووردن بە شکاندنی کەرامەتی خۆی دەزانێت، ئەمەش کارێکی هەڵەیە، بەڵام بە پێچەوانەوە پیاوانی ڕۆژئاوا کارێکی ئاساییە لەلایان.

بێگومان شێوازی دەربڕین لە نێوان ئافرەتو پیاودا جیاوازەو دەکرێت بیانکەین بە دوو بەشەوە:

لێبوردنی ڕاستەوخۆ: باشترین ڕێگایە بۆ ئاشتبوونەوەی هەردوولا، هەر لایەك زۆر زوو داوای لێبووردن بکاتو دان بە هەڵەی خۆیدا بنێت، ئەگەر هەڵەکە بچوك بێت یا گەورە، گرنگ ئەوەیە هەڵەکردن بەرامبەر کەسێك کە هاوبەشی ژیانێتی بەلاوە زەحمەتە، ئەم شێوازەش زیاتر لە لای ئافرەتان دروست دەبێت، چونکە بە سۆزترن لە پیاوان، بۆیە کاتێك خێزانەکەت داوای لێبووردنی لێکردی تۆش لێی ببورەو بەهانەی پێمەگرەو هەڵەکانی بەسەردا دووبارە مەکەوە!

لێبوردنی ناڕاستەوخۆ: ئەمەش چەند شێو ا ز ێك دەگرێتەخۆ زۆر جار پیاوان بەکاری دەهێنن، بۆیە داوا لە هاوسەران دەکەین ئەگەر شێوازی لێبووردنی پیاوانی ڕۆژئاوات بەلاوە ناشرینە دەتوانیت ئەم شێوازی ناڕاستەوخۆیە بەکاربهێنیت لە لێبوردندا، داواش لە ئافرەتانی خۆشەویست دەکەین کاتێك ئەم شێوازی لێبوردنەیان بەدیکرد لە هاوسەرەکەیاندا قبوڵی بکەن.

جۆرەکانی داواکردنی لێبوردن بە ناڕاستەوخۆ:

*قسەکردنی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کە بزانێت تۆ گوێت لە وتەکانێتی بۆ نموونە: بە شانازی کردن یا ناوهێنانت بە شێوازێك کە بزانێت دڵخۆش دەبیت پێی تۆش لێبوردنی خۆت دەربڕە بەرامبەری.

* تەلەفۆنی بەبێ هۆ: هەروەك دەزانیت ڕۆژانی تر بەو جۆرە تەلەفۆنی نەکردووە یا ئەمڕۆ جیاوازە زۆر بەپەرۆشەوە

هەواڵت دەپرسێت ئەوە نیشانەی داواکردنی لێبووردنە، تۆش لێی ببورە، بە جۆرێك وەڵام بدەوە کە زیز بوونێك نەماوە لە نێوانتاندا.

* گاڵتەکردنو نوکتەهێنانەوە: واتە گاڵتەیەك دەکات، یاخود نوکتەیەك دروست دەکات بۆ ئەوەی پێبکەنیت، ئەوە نیشانەی دەربڕینی لێبووردنە تۆش لێی ببورە.

* هەوڵدان بۆ یارمەتیدانت: هەڵدەستێ بەجێبەجێکردنی کارێك یا یارمەتیدانت لە کاروباری ناوماڵدا ئەوە بزانە داوای لێبوردنت لێ دەکات، ئەگەر کارەکەت بە دڵ نەبوو، مەڵێ تۆ کەی ئیشت کردووەو ئیشت زانیوە!

* دیاری: هاوسەران کاتێك خێزانەکەیان زیز دەکەن حەزدەکەن ئەو هەڵەیەی خۆی لە بیری خێزانەکەی بباتەوە بە دیارییەك داوای لێبوردنی لێدەکات، تۆش دیارییەکە قبوڵ بکەو دەستخۆشی لێ بکە.

* منداڵ: ئەمەش جۆرێکە لە شێوازی لێبوردنی ناڕاستەوخۆ لە لای هەندێ هاوسەر منداڵەکەی بەکار دەهێنێت وەك شێوازێك بۆ دەربڕینی لێبووردن، چونکە دەزانێت کە دایك حەزناکات منداڵەکەی بە هیچ کێشەیەکی نێوانیان بزانێت، ئەمەش وا دەکات کە دایك نکوڵی بکات لە زیزبوونیان!

هەندێ جاریش ئەگەر ئافرەتێك نەتوانێ ڕاستەوخۆ داوای لێبووردن بکات ئەوا ئەم شێوازە بە باشتر دەزانێت بۆ هاوسەرەکەی.

هاوسەری بەڕێز: کاتێك خێزانەکەت هەڵەیەکی بەرامبەر کردو نەیتوانی ڕاستەوخۆ داوای لێبوردنت لێ بکات، بەڵام بە شێوازی ناڕاستەوخۆ داواکەیت بینی ئەوا لێی ببورە.

بۆنموونە: دەبینیت خواردنێکی زۆر جیاواز لە ڕۆژانی ئاشتی بۆ ئامادە کردوویت، ئەوە نیشانەی دەربڕینی داوای لێبووردنە تۆش لێی ببورە، یا جوانکارییەکی لە خۆیو ماڵەکەدا کردووە زیاتر لە ڕۆژانی تر، ئەوە نیشانەی لێبووردنە یا هەر جۆرە وتەو هەڵسوکەوتێکی جیاواز لە ڕۆژانی تر، بێگومان بە خێزانەکەت خۆشی دەوێیتو حەز بە ئاشتبوونەوەو تەبایی دەکات لە گەڵتدا.

لەکۆتاییدا داواکارم لە هەمووخێزانێك کە لێبوردەو دڵفراوان بن بەرامبەر یەکتریو هەمیشە سۆزو بەزەیی میوانی نێو ماڵەکانتان بێت.

# کێ بە ڕاستی هەژارە؟!

و/ هێمن موحەممەد عەلی

زۆربەی خەڵکی لەسەر ئەوە کۆکن.. هەژار بریتییە لەو کەسەی کە پارەو سەروەتو سامانی نەبێت... بەڵام هەژاری ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە یەخسیرو دیلی نەزانیو هەواو ئارەزووەکانیەتی.. ئەو کەسە هەژارە کە دڵو دەروونی، بەهۆی خۆ بە گەورەزانینو ستەمەوە، ڕەش داگەڕاوە.. ئەو کەسە هەژارە کە هەستی مرۆڤایەتی لە ناخیدا بارگەو هەواری پێچاوەتەوەو لێی تۆراوە..

هەموو دووڕوویەك، هەموو دزێك هەژارە..

هەموو ناپاکێك، هەموو داگیرکەرێك هەژارە..

هەموو حەسوودێك، هەموو کەسێکی قسە بەرو قسە هێنەر هەژارە...

هەموو ئەو کەسانەی کە بە ماڵو سامانیانەوە دەنازن، هەژارن...

هەموو ئەو کەسانەی کە بە هۆی عەرەقو ماندوویەتی غەیری خۆیانەوە، دەخۆنو دەخۆنەوە، هەژارن..

هەموو ئەو کەسانەی بۆ بەرزی خۆیان، هەوڵ دەدەن دەوروبەریان زەلیل بن، هەژارن...

هەموو ئەو کەسانەی کە سوار ئەسپی هەواو ئارەزووەکانیان بوون، هەژارن...

هەموو ئەو کەسانە هەژارن، کە خەمی ڕواڵەتو گەورە کردنی شکڵیانن...

هەموو ئەو کەسانە هەژارن، کە چاو لە ئاستی ڕاستییەکان دەنووقێنن...

ئەو کەسانە زۆر هەژارن، کاتێك ماڵو سامانێك بە ناپاکیو ناهەقی پەیدا دەکەن، کەچی شانازیشی پێوە دەکەن..

ئایا ئەو کەسانە لە باتی قاقاو خەندە، هەق وانییە ئەسرین بڕێژنو حەسرەت بکێشنو چاوێك بە ڕابردووی خۆیاندا بخشێننەوە؟!

دەی منو تۆش با سەیرێکی خۆمان بکەینو بزانین ئێمەش لەو کەسانە نین؟!

ئایا هیچ ڕەوشتێك لەو ڕەوشتانەمان تێدایە؟! ئەگەر وەڵامەکەمان: (بەڵێ)یە، با لە خۆمان بپرسینەوەو هەوڵ بدەین خۆمان چاك بکەین.. ئەگەر وەڵامەکەشمان بریتییە لە (نەخێر)، ئەوا با سوپاسی خودا بکەینو داوای لێ بکەین زیاتر ئاکارو ڕەوشتو ڕەفتارمان جوان بکاتو لێی بپاڕێینەوەو بڵێین: ئەگەر بە سەروەتو سامان هەژارین، دەروونو ڕەوشتمان دەوڵەمەند بکەیت...

زانایەکیش دەڵێت: ئەو کەسەی کەمی هەیە هەژار نییە، هەژار ئەو کەسەیە کە زۆر داوا دەکات..

سەرچاوە: کتێبی «سهرة عائلية»

# سێ وشەی ئەفسووناوی

و: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

با منداڵەکانمان فێری ڕۆشنبیری ئەم سێ وشەیە بکەین:

١- بەیارمەتیت! چەندە جوانی... کاتێك داوای شتێك لە یەکێك دەکەیت، بڵێیت بە یارمەتیت!

٢- بمبوورە! چەند قەشەنگی... ئەگەر هەڵەیەکی زۆر بچووکیشت کرد، بڵێیت بمبوورە!

٣- سوپاس! چەندە ڕێکوپێکی... کاتێك کارێکت بۆ ئەنجام دەدەن، بڵێیت سوپاس!

زۆربەی خەڵکی... شتوومەکی خەڵك دەبەن... بێ ئەوەی بڕیاری ئەوانی لەسەر وەربگیرێت بە وشەی (بەیارمەتیت)!

هەروەها زۆر بەیان... هەڵە دەکەن، زیانت پێ دەگەیەنن بە جیاوازی هەڵەکانیانو چروکیش ناکەن لەسەر زەنشت کردنتدا... یان بەدگومانی بەرامبەرت...

بەڵام ڕەزیلی دەکەن بە وشەیەك کە (ببوورە)یە!

زۆربەی ئەو خەڵکە....

خزمەتیان پێ دەگەیەنن... هاوکاریان دەکەن... پشتگیرییان لێ دەکەن... زۆر جار ژیانیان ڕزگار دەکەن!! زۆر لەوە زیاتریش... بەڵام زۆر بەداخەوە... گوێت لە وشەیەکیان نابێت کە (سوپاس)ە!

زۆربەی زۆری خەڵك ناتوانن ئەم سێ وشەیە دەربڕن...

ئەم قسەیە واڵێك دەدەنەوە بە (ساویلکەیی) یان بە (کەسایەتییەکی لاواز)!

وای لێك دەدەنەوە (قسەیەکی بێبایەخە) هەم بۆ تۆ هەم بۆ ئەوان!

بەڵام ئەوان نازانن... کاتێك ئەوکەسانەی برینداریان کردوون یان هەڵەیان بەرامبەر کردوون لە سەر مافەکانیان دەڵێن: بمبوورە... ئەوا چ دەرمانێکیان خستۆتە سەر ئەو برینەی کە برینداریان کردووە!

هەروەها...ئەوان نازانن... کاتێك یەکێك چاکەیەکیان بەرامبەر دەکات... یان چاکەیەکیان بۆ ئەنجام دەدەن بڵێن (سوپاس)، ئەوە ڕێز لە بکەر دەگیرێت... پاداشتی خۆی دەداتەوە... هەروەها گوروتینی زیاد دەکات بۆ چاکەکردن... بەوە ئەوان دەرگای خۆشەویستی بە ڕووی ئەواندا دەکەنەوە!

هەروەها... ئەوان نازانن بڵێن کاتێك حەزیان لە شتێکی دیاریکراوە یان داواکاری ئەنجام دانی کارێك دەکەن بڵێن (بەیارمەتیت)!

ئەوە دەرگای (خۆشەویستی) دەکاتەوە لە نێوان ئەوانو ئەوانەی کە داوای لێکردوون... هەروەها ئەوە هاوکاری دەکات بۆ بە دەستهێنانی ئەو شتانەی حەزیان لێ دەکاتو زیاتریش... جگە لەوە ئەو کەسە پارێزراو دەبێتو ڕێزلێگیراو دەبێتو تایبەتمەندییەکانی پارێزراو دەبن... جێگاو شوێنیشی...

لەبەر ئەوە ئەو وشانە...

دەرگای خۆشەویستیو دۆستایەتی دەکاتەوە...

پارێزگاری لە تواناو کەسایەتی دەکات...

کەسایەتی ڕێز لێگیراو دەبێت...

برینەکان سارێژ دەکات...

ئەندێشەکان بۆنخۆش دەکات...

گەرم و گوڕی بکەر زیاد دەکات...

ڕێز لە ماندووبوون دەگیرێت...

لە پێناو هەموو ئەوانەدا...

با خۆمان ڕابهێنینو منداڵو خانەوادەکانیشمان ڕابهێنین.... برادەرەکانیشمان ڕابهێنین!

بۆئەوەی پارێزگاری لە مافەکانی خەڵك بکەین... داوای یارمەتیان لێ بکەین!

هەروەها داوای یارمەتیان لێ بکەینو داوای لێبووردن لە هەڵەکانمان بکەین!

هەروەها ڕێز لە ماندووبوونیان بگرینو چاکەکانیان بنرخێنین...

بۆیە ئەوە ئەم ڕۆشنبیرییەیە... کە لای هە موو کەسێك دەست ناکەوێتو... سێ وشەی... ئەفسووناوین!

سەرچاوە: ئینتەرنێت

# ١٠ بنەمای بنەڕەتی لە ئەتیکێتی نامەی ئەلیکترۆنیدا

و: ئەمانی تەحسین

١- نامـــەی ئەلیکترۆنی بە کاربێنە بەو شـێوەیەی کە خەڵك پێیان خۆشە بەکاری بێنن.

پاشـەڕۆژو ئێسـتای زۆر کەسـت لـە بەردەسـتدایە، چونکـە کاتێك کە نامەی ئەلیکترۆنی دەنووسی پێویستە ئاگاداری داڕشـتنی وشـەکانتو فۆنتی نووسینەکەت بیت.

٢- دیسـان چاو بخشـێنەرەوە بەو نامەیەی کە دەتەوێ بینێری... شتێك مەنێرە کە ناتەوێ بینێری... لەوانەیە شـتێك بنوسـیو پاشان بیسـڕیتەوەو پاشـان بیـرت بچێت...کەواتە چاوێك بخشێنەرەوە بە نامەکەدا.

٣- ئـەو نامەیەی کە بۆت هاتووەو داوای وەڵامـت لێدەکـرێ، بـە هەمان شـێوەی ئەوەی کە بۆت هاتووە وەڵامی بدەرەوە.

٤- ئاگاداربە لە هەندێ وشەی گاڵتە ئامێـز لـە نامـە ئەلیکترۆنیەکەتدا..

بۆ نموونـە: نەخێر! بەڕاسـت! گاڵتە ئەکەی!

٥- ئـەو نامانەی کـە پێت دەگەن دووبـارە بیانکـەرەوە پێـش ئـەوەی وەڵامیان بدەیتەوە.

٦- کاتێـك دەکەویتـە گومانێکەوە لـە کارەکەتـدا.. نامەیـەك بنێـرەو دوورکەوەرەوە لە نامەی **html**، چونکە کەسـی بەرامبەر لەوانەیە ئامادەباشی نەبێت بۆ پێشوازی لە نامەکەت.

٧- بـە پیتـی گـەورە مەنووسـە، چونکـە وەك ئـەوە وایە هـاوار بکەی بەسـەر بەرامبەرەکەتدا، هـاوار مەکە بەسـەر کەسـدا لە نامەکانتدا، چونکە نووسـین بە پیتی گەورە وا دەگەیەنێ کە تۆ توڕەی! هەروەها زۆر بە ئاسانیش هەمـووی ناخوێنرێتـەوە. ئـەم خاڵە زیاتر نامەی ئینگلیزی یاخود نووسینی لاتینی دەگرێتەوە.

٨- پێش ئەوەی نامە بنێری بپرسە کـە بابـەتو نووسـینەکان قەبارەیان گـەورە بێـت یـان نەخێـر! چونکـە لەوانەیە کەسـی بەرامبەر ئامادەباشی نەبـێ بـۆ وەرگرتنی ئـەو بابەتانەی کە تـۆ بە قەبارەی گـەورە ناردووتن، یاخـود سیسـتەمی کۆمپیوتەرەکـەی توانای وەرگرتنی نوسینو شتی قەبارە گەورەی نەبێت.

٩- دوورکەوە لە بەکارهێنانی دەمو چاوە پێکەنیناوییەکان..

وریابـە لە بەکارهێنانـی دەموچاوە پێکەناوییەکان، چونکە لەوانەیە کەسـی بەرامبەر وا هەست بکات کە تۆ مەبەستت نەبـووە نامە بۆ ئـەو بنێری، بەڵکو بۆ زەوقی خۆت ئەو کارەت کردووە.

١٠- دوورکـەوەرەوە لە بەکارهێنانی (منیـش هەروەها)، چونکـە وەڵامێکی ئیجابی نییە، بەڵکو زیاتر وا دەکات کە کەسی بەرامبەر توڕە بکات لە زۆربەی کاتەکاندا.

سەرچاوە: مجلە (عالم الابداع).

# ئەگەر ئەو نەبوایە!

و: راز هەڵەبجەیی

دەبوا پارەکەم لە شاباز وەربگرتایەتەوە، تا نەشتەرگەریی بۆ چاوەکانی دایە گیان ئەنجام بدەم!

دکتۆر دوێنێ وتی:

کاکە مورتەزا ئەگەر تا دوو سێ رۆژی تر نەشتەرگەری بۆ چاوەکانی دایکت نەکەیت کوێر دەبێت! دکتۆر ئەمەی وت! تەنها رێگە چارە لەبەردەممدا بۆ نەشتەرگەری کردنی چاوە جوانەکانی دایکی ئازیزم وەرگرتنەوەی ئەو بڕە پارەیە بوو کە نزیکەی ساڵێك لە مەوبەر دابووم بە یەکێك لە باشترین هاورێکانم کە لە سەردەمی قۆناغی سەرەتایمدا لەگەڵ ئەودا گەورە بیووم، بۆئەوەی بازرگانی پێوە بکاتو منیش هەموو مانگێك قازانجەکەی وەربگرم، بەڵام جگە لە مانگی یەکەم ئیتر هیچ پارەیەك لە لایەن شابازەوە بە من نەدرا، هەر مانگێك بیانوویەکی دەهێنایەوە، بەڵام لە مانگی حەوتەمدا بە ئاشکرا دەستی بە پاڕانەوە کرد کە بارودۆخی بازاڕ خراپ بووەو هەموو ئەو کەسانەی کە لە کۆمپانیاکەدا سەرمایەیان داناوە داوای پارەکانیان دەکەنو...

ئەو کاتە زانیم کە یارییەکە دەست پێ دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر هاوڕێیانە پێم گوت: هەرچی قازانجی پارەکە هەیە هەمووی بۆ خۆت تەنها دەست مایەکەی خۆمم بۆ بگەڕێنەرەوە تا نەشتەرگەری بۆ چاوەکانی دایکم بکەم... ئیدی کەم کەم کەسایەتی راستەقینەی شابازم بۆ دەرکەوت، منو شاباز وەکو وتم: لە سەردەمی سەرەتاییدا پێکەوە هاورێ بووین، لە بیرم دێ ئەو کات باوکی رەحمەتیم هەمیشە لە بارەی شابازەوە دەیگوت:

گورگ زادە ئاخرەکەی هەر دەبێتە گورگ!

هەڵبەتە من لەبارەی گورگ بوونی باوکی شابازەوە لاریم نەبوو، تاوانبارێکی لێهاتووبوو، قومارو دزی کاری رۆژانەی بوو سەرەنجام لە مامەڵەیەکی هیرۆیین دا لە لایەن بەرامبەرەکانییەوە کوژرا.

باوکم راستی وت! هەفتەی پێشوو چوار ساڵ پێش مردنی ئەو لەوە تێگەیشتم، کاتێك کە رۆیشتم بۆ لای شابازو پێم وت:

ئەگەر نەشتەرگەری بۆ دایکم نەکەم کوێر دەبێت... هاتووم تا پارەکەم بۆ بگێرێتەوە!

شاباز قسەیەك کە دەبوایە هەر زوو بیدرکاندایە درکاندی:

ئەوەندە مەڵێ پارەکەم... پارەکەم... ئەگینا ناچار دەبم پێت بڵێم بە چ بەڵگەیەك دەیسەلمێنی کە پارەت بە من داوە؟!

ئەمە هەر ئەو چاڵەبوو کە خۆم بۆ خۆمم هەڵکەندبوو.

هەر ئەو رۆژە -بە قسەی دایکم- پارەی بێ زمانم دایە دەستی مرۆڤی زماندار، بە هەر شێوەیەك بووایە دەبوو پارەکەم لە شاباز وەرگرتایەتەوە...! ئەوەم دەزانی کە ئەو پەیمانە گرنگەکانی لە ماڵەوە لەسەر سفرەی نانی ئێوارە دەبەستێت. ماڵێك لە شێوەی کۆشکدا بوو، ئەو بە دانانی کۆمپانیایەك کەسانی وەکو منی بێ چارە دەکرد.

ئەو شەوە بریاری خۆمم دابوو خۆشبەختانە ئەو کلیلەی کە پێی دابووم لام مابوو، توانیم بە ئاسانی برۆمە ماڵەوە، ئەو لەسەر مێزی نانخواردن بوو، سەرقاڵی مامەڵەیەك بوو لەگەڵ پیاوێکی پەنجا ساڵەو پێی دەگوت: تۆ بەو پەنجا ملیۆن تمەنەی کەدەیدەیت بە من مانگانە سێ ملیۆن تمەن قازانج وەردەگریت، لە راستیدا دوای ماوەیەکی کەم دەبیتەوە بەخاوەنی دەست مایەکەی خۆت، دوای ئەوەش مانگانە سێ ملیۆن تمەنی خۆت هەیەو..

بە شەق دەرگای ژوورەکەم کردەوەو چوومە ژورەوەو هاوارم کرد:

راست دەکات مانگی سێ ملیۆنت هەیە، بەڵام ئەگەر دایکت تەنها لەبەر دوو ملیۆن تمەن لە حاڵەتی کوێر بووندا بێت، ئەم فێڵبازە نەك ئامادە نییە قازانجی پارەکەت بداتێ، بەڵکو ئامادەش نییە دەست مایەکەی خۆت بداتەوە... لە هەمان کاتدا وەکو گورگ رووبەرووت دەوەستێو هەر ئەم پێکەنینە شەیتانیانە دەخاتە سەر لێووو بە ساردوو سڕییەکەوە دەڵێ: کام پارە؟ چ بەڵگەیەکت هەیە تا بیسەلمێنی کە پارەت بە من داوە؟

ئەمانەم وتو لە کاتێکدا کە میوانەکەی شاباز بەسەرسوڕمانێکەوە سەیری دەکردم پێم وت: هەڵبەتە لەوانەیە تۆ وەکو من بێ ئەقڵ نەبیت کە بە هۆی بیست ساڵ هاوڕێیەتییەوە لەم گورگ زادەیە پسوڵە وەرنەگریت.

ئەو بە هەرجۆرێك بێت پارەکەت دەباتو......

بێدەنگبە، ونبە لەبەرچاووم، لێرە بڕۆرە دەرەوە...

ئەمە شاباز وتی، منیش کە شێت ببووم بەرەو رووی رۆشتمو پەلامارم داو لە دواوە قژیم گرتو پێم وت: تۆ بێدەنگبە نا مەرد... یان پارەکەم دەدەیتەوە یان......

هێشتا قسەکەم تەواو نەکردبوو لە ناکاو دوو گەنجی گەورە کەتە کە لەدوایدا زانیم پارێزەری شابازبوونو لە هەمان کاتیشدا پیاوی ئەو بوون بۆ تاوانکاری لە دواوە دەستیان گرتمو چاوەڕێی ئاماژەیەکی شاباز بوون تا سەرم بخەنە سەر سنگم! هەڵبەتە ئەویش ئەگەر نیگەرانی ئەوە نەبوایە میوانی هەیە ئەوە کارێکی ئاسایی بوو لە لای، بەڵام لەو کاتەدا تەنها چەند بۆکزو شەقێکم خواردو لە ماڵەکە کردمیانە دەرەوە، لەوەی کە بێچارەییو لێدان ببووە چارەنووسم نا، بەڵام لەوەی کە دایکم خەریکبوو لەبەر چاوم کوێر دەبوو، منیش نەم دەتوانی هیچ کارێکی بۆ بکەم، هەر لەوێدا لە کەناری شۆستەکەدا لەبەردەم ماڵی شابازدا دانیشتمو دەستم

کرد بەگریانێکی زۆر بە کوڵ، لە ناکاو دەستێك کەوتە سەرشانم: پیاو خۆ ناگری کوڕی گەنج!.... کە ڕووم وەرگێرا هەر ئەو پیاوەم بینی کە میوانی شابازبوو... هەر ئەوەی کە بڕیاربوو پەنجا ملیۆن تمەن بدات بە شاباز. سەرم داخستو ویستم خواحافیزی بکەم، وتی: ڕاوەستە گیانە.... کارم پێتە... لە پاشاندا لەگەڵم کەوتە پیاسە کردن، سەرەتا باسی خۆی کرد: چەندین ساڵە لە ژاپۆن کارم دەکەم و بە پارەکەم خانویەكو ئۆتۆمبێلێکم کڕیو دوکانێکیش کە تا چەند مانگێك لەوەوپێش خۆم بە ڕێوەم دەبرد، بەڵام کاتێك کە دکتۆرەکان پێیان وتم تووشی نەخۆشی دڵ بوویتو دەبێ پشوو بدەیت، دوکانەکەم فرۆشتو دەم ویست پارەکەم بدەمە دەستی شاباز تا مانگانە قازانجەکەیم بداتێ کە...

قسەکانی (ئەمیر خان) تەواو بوو نۆرەی من هات، باسی خۆم کردو پاشان باسی شابازو هاوڕێیەتیمان لە منداڵییەوە تا ئێستاو پاشان باسی دایکم کرد کە خەریکە کوێردەبێتو... دیسان گریام، بۆئەوەی کە دووبارە نەڵێ پیاو نابێ بگری، ویستم خواحافیزی لێ بکەم وتی: دوو کارم پێتە... یەکەمیان ئەوەی کە ئەگەر بزانم گەنجێکی پاكو گرجوگۆڵی... بەم پارەیەم ئوتویەکی هەڵمی دەکڕمو تۆ دادەنێم لەسەری تا کار بکەیت بە شێوەی هاوبەش، سێ یەکی بۆ تۆو دوو لە سێی بۆ من، پێکەوە ڕێك دەکەوین، کاری دووەمیشم ئەوەیە کە تۆ ئەمشەو فریشتەی ڕزگاری من بوویت... واتە ئەگەر نەگەشتبایتو ڕووخساری ڕاستەقینەی شابازت پیشان نەدامایە لەوانەیە پاش ساڵێك وەزعی منیش وەکو وەزعی ئێستای تۆی لێ بهاتایە... هەر لەبەرئەوە ئامادەم ئەو دوو ملیۆنەت بە قەرز بدەمێ کە بۆ نەشتەرگەری دایکت پێویستتە تا لە دواییدا وردە وردە بم دەیتەوە، لە هەمان کاتیشدا ئەگەر پێشنیاری شەریکی یەکەم قبوڵ نەکەیت هەر ئەو دوو ملیۆن تمەنەت دەدەمێ... کەواتە جارێ ئەو پارەیە وەرگرەو بڕۆ بە لای دایکتەوە دوای ئەوەی کە چاوی چاك بوویەوە وەڵامم بدەرەوە!

ئەمڕۆ نزیکەی یانزە مانگ لە کاری هاوبەشی منو (ئەمیر خان) تێ دەپەڕێ، هەندێجار لە خۆم دەپرسم ئەگەر خودا ئەم مەردەی بۆ نە کردمایە بە هۆکاری ڕزگار بوونی دایکم، ئەوا ئێستا دایکم لە پشت پەردەی تاریکی هەتا هەتاییەوە زیندانی ببوو.

گۆڤاری روزهای زندگی/ ژ۲۵۲۰.

# خێزانەکەی گوێی قورسە یان...؟

و/ ئەسکەندەر ڕەحیم

پیاوێك سەرنجی دا گوێی هاوسەرەکەی قورس بووەو بیستنی کەم بۆتەوە. پێی وابوو دەبێ هاوسەرەکەی بیستۆك بەکاربهێنێ، بەڵام نەیدەزانی ئەم بابەتە چۆن بخاتە ڕوو.. بەم هۆیەوە بردی بۆ لای پزیشكو لەگەڵیدا گرفتەکەی باس کرد.

پزیشکەکە وتی: (بۆ ئەوەی بتوانیت وردتر ئەندازەی نەبیستنی هاوسەرەکەت بە من بڵێیت.. تاقیکردنەوەیەکی سادە هەیە، لە ماڵەوە ئەنجامی بدە.. سەرەتا لە دووری چوار مەترەوە بە دەنگێکی ئاسایی بانگی بکە.. ئەگەر نەیبیست لە دووری سێ مەترەوە.. دواتر لە دووری دوو مەترەوە.. ئیدی بەم جۆرە تا وەڵام دەداتەوە، ئەم کارە ئەنجام بدەو ئەنجامەکەشی بە من ڕابگەیەنە).

ئەو ئێوارەیە خێزانەکەی لە چێشتخانە سەرقاڵی ئامادەکردنی خواردنی ئێوارەبوو، خۆشی لە ژووری میوان دانیشتبوو. لە دڵی خۆیدا وتی: ئێستە دووری نێوانمان چوار مەترە، با تاقیکردنەوەکە ئەنجام بدەم.. پاشان بە دەنگێکی ئاسایی لە خێزانەکەی پرسی: (ئازیزەکەم بۆ شێو چیمان هەیە؟)

وەڵامێکی نەبیست... پاشان لە جێی خۆی هەستاو مەترێك بەرەو چێشتخانەکە چووە پێشەوەو دووبارە پرسی: ئازیزەکەم بۆ شێو چیمان هەیە؟

دیسانەوە وەڵامێك نەبوو... ئەمجارەش زیاتر بەرەو پێشەوە چوو.. لە ناوەڕاستی هەیوانەکە کە نزیکەی دوو مەتر دووری لەگەڵ چێشتخانەو خێزانەکەیەوە هەبوو.. وتی: ئازیزەکەم بۆ شێو چیمان هەیە؟

دیسانەوە وەڵامێکی نەبیست... دواتر چووە پێشەوەو گەیشتە دەرگای چێشتخانەکە.. پرسیارەکەی کردەوەو وەڵامێکیش دەنگی نەبوو.

ئەم جارە چووە پێشترو ڕێك لە پشت سەری خێزانەکەیەوە وتی: ئازیزەکەم بۆ شێو چیمان هەیە؟

خێزانەکەشی وتی: مەگەر نابیستی؟! ئەوە پێنجەم جارە دەڵێم: مریشکی برژاومان هەیە!!!

ئێستە دەزانین خێزانەکەی گوێی قورسە یان هاوسەرەکەی؟!

لەم بەسەرهاتەوە فێردەبین.. ڕەنگە گرفتەکە بەو جۆرەی کە هەمیشە بیر لە کەسانی دی دەکەینەوە.. دەرنەچێت.. دوورنییە گرفت لە خۆماندا بێت.

سەرچاوە: ئینتەرنێت

# مافەكانی منداڵ لەسەر دایك و باوك

ئا/ سالم ئەحمەد مستەفا

خێزان ئەو پێكهاتەی كۆمەڵگەیە كە تاكەكانی هۆگری یەكترینو بەخۆشی یەكتری دڵخۆشنو لە نەخۆشیو جیا بوونەوەیاندا هەموویان پەژارە دەیانگرێتەوەو كاریگەری دەروونی دەبێت لە سەریان، هەر بۆیە چەندە خێزان لە ناوخۆیاندا بە بەزەییو لەخەمی یەكتریدا بن ئەوەندە بەختیارو ئاسوودەن لە ژیاندا، خێزان لە باوكو دایكو منداڵ پێكهاتووە، هەرچۆن باوكو دایك مافیان هەیە لەسەر ڕۆڵەكانیان ئاواش باوكو دایك بە هاوبەشی بەرپرسیارن بەرامبەر ڕۆڵەكانیان هەریەكە لە بواری خۆیداو پێویستە پارێزەری مافی منداڵەكانیان بن، ئەو مافانەش لە (نطفە)وە دەست پێ دەكاتو بە دامەزراندنی هەریەكەیان لە ماڵی خۆیدا كۆتایی دێت ئەمەش كۆششێكی زۆری دەوێو بەرپرسیارییەكی گەورەیە. دیارە هەرچۆن جوتیارێك بیەوێ دانەوێڵەیەك بچێنێ پێویستە زەویو كێڵگەیەكی لە بارو بەپیتی بۆ بدۆزێتەوە تاوەكو بەرهەمێكی باشی هەبێ، ئاوەهاش هەر لەسەرەتای پرۆسەی هاوسەرگیرییەوە پێویستە پیاو وردەكاری بكات لە دۆزینەوەی هاوسەرێكی باش بۆ بەرهەمهێنانی نەوەو وەچەیەكی بە سوود بۆ كۆمەڵگەكەی پەروەردگاریش لە قورئاندا دەفەرموێت: ( نسائكم حرث لكم/ البقرە ٢٣) واتە : هاوسەرەكانتان كێڵگەن بۆتان. پێغەمبەریش (صلی الله علیە وسلم) دەفەرموێت: (كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعیتە) واتە: هەریەكە لە ئێوە سەرپەرشتیاری ئەوانەن كە چاویان لێتانەو پێویستە خۆش بەختیو كامەرانیان بۆ بڕەخسێننو لە زیانو خراپە دووریان بخەنەوە. مافەكانیش ئەمانەی خوارەوەن: دانانی ئەو تۆوو (نطفة)یە لەو شوێنەدا كە بۆی بڕیار دراوەو بەرهەم دارە كەمنداڵدانی دایكە تاوەكو ژیانی مرۆڤایەتی بەردەوام بێت:

١- قۆناغێكی تری مافی منداڵ قۆناغی كۆرپەلەیە كە لەسكی دایكیان دان لەبەر سەلامەتیان پێویستیان بە چاودێری پزیشكی هەیەو لەو كاتەدا ئەگەر ڕۆژوو گرتنی دایك زیانی هەبوو بۆ كۆرپەلە ڕێگەی پێ دراوە ڕۆژوو نەگرێت تا كۆرپەلە خۆراكو وزەی تەواو وەربگرێتو گەشە بكات ئەمەش ئەوپەڕی ڕەچاوكردنی مافی كۆرپەلەیە.

٢- مافێكی تری كۆرپەلە ئەوەیە كە پارێزگاری لێ بكرێو بە هیچ ڕێگەو هۆیەك لە بارنەبرێت، پێشەوای داد پەروەر (عومەری كوڕی خەتاب) خوای لێی ڕازی بێت" بووە هۆی ترساندنی ئافرەتێكی سكپڕ سكەكەی خست منداڵەكە دووهاواری كردوو مرد، پێشەوا عومەر ڕاوێژی بە هەندێ لە هاوەڵان كرد، هەندێكیان ئاماژەیان كرد كە هیچت لەسەر نییە، چونكە تۆ سەرپەرشتیاری موسوڵمانانی. عەلی كوڕی ئەبوتالیبش بێدەنگ بوو، پێشەوا عومەر ڕووی تێكردو وتی: تۆ چی دەڵێی باوكی حەسەن؟ وتی: ئەگەر ڕای خۆیانیان دەربڕیوە هەڵەیان كردووە، ئەگەر بە هەواو هەوەسی تۆ وەڵامیان داوەتەوە ئامۆژگارییان نەكردووی، بێگومان خوێنەكەی لەسەر تۆیە، چونكە تۆ ئافرەتەكەت ترساندو سكەكەی لەبارچوو. پەروەردگاریش لە قورئاندا كوشتنی منداڵی قەدەغە كردووەو فەرمویەتی: (ولاتقتلوا أولادكم خشية إملاق نحن نرزقهم وإياكم إن قتلهم كان خطئا كبيرا / الأسراء ٣١) واتە : منداڵەكانتان بە بیانوی نەبوونیو برسییەتی مەكوژن، چونكە نەك هەر ئەوانی بێ توانا ئێوەش هەر ئێمە ڕزقو ڕۆزیتان دەدەینێ ئەوە هەڵەو تاوانێكی گەورەیە.

٣- هەروەها ئیسلام جێبەجێكردنی (حەدی شەرعی) حەرام كردووە، لەسەر دایكی سكپڕو دوای خستووە تاوەكو منداڵەكەی ببێتو پاشان شیری بداتێو لە شیری ببڕێتەوە، نەوەكو ژیانی كۆرپەلە بكەوێتە مەترسییەوە.

٤- مافێكی تری منداڵ پاش لە دایكبوونی ئەوەیە كە ناوێكی خۆشو جوانی لێ بنرێ، چونكە شوێنەوارێكی دەروونی پەروەردەیی دەبێت لەسەر منداڵو خۆشیو شادی دەخاتە دڵییەوەو لە كۆمەڵگەدا هەست بە كەموكوڕی ناكات، هەروەها شانازیو ئاسوودەیی دەخاتە دەروونی باوكو دایكەوە.

٥- مافێكی تری ئەوەیە كە دایكو باوك سوپاسی خوا بكەن بە هاتنە دنیاییو حەیوانیش سەربڕنو بەو بۆنەیەوە شادیو بەختەوەری دەرببڕن.

٦- پێویستە ئەو منداڵە بدرێتە پاڵ باوكی خۆیو خێزانی دیاری بێت، تاوەكو لە تیاچوون بپارێزرێو خێزانەكانیش هەڵنەوەشێنرێنەوەو سەرگەردان نەبن.

٧- ئەركی سەرشانی دایكو باوكە ئەو منداڵە پەروەردە بكەنو بۆ هەرقۆناغێك لە قۆناغەكانی ژیانی پێویستییەكانی بۆ دابین بكەنو پێی بگەیەننو لەم بوارانەدا (بواری جەستەیی، ژیری، بیروباوەڕی، زانستی، دەرونی، ڕۆشنبیری، ڕەوشتی، پیشەیی) كەواتە چ كوڕو چ كچ بێ جیاوازی باوكو دایك لێیان بەرپرسیارن تا هەریەكەیان دەبێتە خاوەنی هاوسەرێكی باشو هاوتای خۆی. بە هیوای پەروەردەكردنی نەوەیەكی بە سود بۆ دروستكردنی كۆمەڵگەیەكی بەختیارو كامەرانو ئاسوودە لە ژیاندا.

سەرچاوەكان: قورئانی پیرۆز/ فلسفه نظام الأسرة في الأسلام. د. أحمد الكبیسی.

# خۆشەویستی راستەقینە!

و/ بەهمەن لەتیف فەتحوڵڵا

وانەی ئەم جارەیان لە قوتابخانەیەکی بنەڕەتییەوەیە، لەم قوتابخانەیەدا یەکێک لە مامۆستاکان بڕیاریدا بۆ ماوەی هەفتەیەک یارییەکی سەرسوڕهێنەر بە قوتابییەکانی بکات.

مامۆستاکە داوای لە قوتابییەکان کرد هەر یەکەیان کیسێک بهێنێت کە لە نێویدا چەند پەتاتەیەك هەبێتو هەریەکە لە پەتاتەکان ناوی ئەو کەسەی لێ بنێن کە ڕقیان لێیەتی، ئێستا هەریەك لە قوتابییەکان کیسێکیان پێیەو بە ژمارەی ئەو کەسانەی رقیان لێیە پەتاتەی تیایە.

لە رۆژی دیاریکراودا هەر یەکە لە قوتابییەکان کیسەیەکو چەند پەتاتەیەکیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، کە ناوی ئەو کەسانەیان لێ نابوون کە رقیان لێ بوو، هەندێکیان دوو پەتاتە یان سێ پەتاتەو هەندێکی تریان پێنج پەتاتەو، ئیدی بەم شێوەیە...

پاشان مامۆستاکەیان دەستووری یارییەکەی بۆ شیکردنەوە، داوای لێکردن هەریەکە لە قوتابییەکان کیسە پەتاتەکەی خۆی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرێت بۆ ماوەی هەفتەیەك بۆ هەر شوێنێك بڕوات بیبات.

دوای چەند رۆژێك قوتابییەکان هەستیان بە بۆنێکی زۆر ناخۆش دەکرد، بۆنی پەتاتە گەنیوەکانی ناو کیسەکە بوو، بەڵام ناچاربوون بەرگەی بۆنی ناخۆشی کیسەکەو لە هەمان کاتدا قورسی کێشی کیسەکەش بگرن. بە دڵنیاییەوە تا ژمارەی پەتاتەکان زیاتر بێت ئەوە بۆنەکەی تیژترو کێشەکەشی قورستر دەبێت.

دوای تەواو بوونی هەفتەکە قوتابییەکان زۆر دڵخۆشبوون بە تەواو بوونی یارییە سەرسوڕهێنەرەکە.

مامۆستاکە پرسیاری لە قوتابییەکان کرد دەربارەی هەستو نەستیان لە کاتی هەڵگرتنی کیسە پەتاتەکە بۆ ماوەی هەفتەیەك، قوتابییەکان گلەییان لەو هەموو ئازارو ناخۆشییە دەکرد کە لە کاتی هەڵگرتنی ئەو کیسە قورسە بۆن ناخۆشەدا توشیان هاتووە.

لە کۆتاییدا مامۆستاکە سودو وانەکانی ئەم یارییەی بۆ قوتابییەکان شیکردەوە:

وتی: ئەمە پڕاوپڕ وێنەی ئەو ڕقەیە کە هەریەك لە ئێوە بەرامبەر کەسێك لە دڵتاندا هەڵیدەگرن، رقوکینە دڵەکان پیسو بۆگەن دەکاتو ناچارت دەکات رقوکینە بکەیتە هاوڕێت بۆ هەرشوێنێك بچیت.

کەواتە ئەگەر ئێوە نەتوانن ئەو بۆنە پیسەی پەتاتەکان بۆ ماوەی هەفتەیەك هەڵبگرن، ئەی بیرتان کردۆتەوە چۆن دەتوانن رقوکینە لە دڵەکانتاندا هەڵگرن بە درێژاییی ژیانتان؟

خۆشەویستی راستەقینە بریتی نییە لە خۆشویستنی کەسێکی تەواو بێ کەموکوڕی، چونکە بە دڵنیاییەوە تۆ کەسێکی لەو جۆرە نادۆزیتەوە، بەڵکو خۆشەویستی راستەقینە بریتییە لەخۆشویستنی کەسێکی خاوەن کەموکوڕی بەشێوازێکی تەواوی بێ کەموکوڕی.

دڵنیابە چۆن بۆنی رقوکینە بڵاو دەبێتەوە بە هەمان شێوە بۆنو بەرامەی خۆشەویستیش بڵاو دەبێتەوە.

سەرچاوە/ www.sudayr.com

# خەمەکانی منداڵێکی هەڵەبجە!

کۆسار سوبحان

کیمیابارانـــی هەڵەبجـــە تەنهـــا گوڵەکانی هەڵنەوەرانـــد، بەڵکو ڕۆحە زیندووەکانیشـــی ئیفلیج کرد، هەربۆیە نازانم لە کوێوە دەســـت بـــە گێڕانەوەکـــەم بکەم، ئەو شـــتانەی کە لە ناخمـــدا کۆببونەوە بـــەردەوام ئازاریان دەدام بەبـــێ ئەوەی دەنگ هەڵبڕم لە ناو ســـینەمدا پەنگیان دەخواردەوە، بەڵام لە ئاست شتەکاندا مرۆڤێکی بێ دەســـەڵات بـــووم، من منداڵێك بـــووم بەرلـــەوەی چاوەکانم بە ژیان ئاشـــنا بێـــت، بەرلەوەی منداڵانی کۆڵان بمناســـن، بە بۆنی ســـێو مەســـت کرابووم، ئیتر کە گەورە بـــووم بوومە مرۆڤێکـــی زەیـــن ئیفلیج وەکو چۆن پەپولەیەك بەرلەوەی لە قۆزاخەکەیەوە بێتـــە دەرەوە باڵەکانی بشـــکێنرێت، کە ئیتر نەتوانێت دیمەنی باخچـــەو گوڵ ببینێت یان هـــەر تەنهـــا چاوەکانی بـــە زەلیلـــی بڕوانێت نەتوانێـــت ماچێکـــی گوڵی بەهار بـــکات، من ڕۆحێکی شـــکاو بووم پێویستم بە هاوزمانێك بـــوو بۆئـــەوەی ژیـــان بگوزەرێنـــم، بـــەڵام کـــەس خـــۆی نەدەکـــردە قوربانی ئـــەو بەها مرۆڤایەتییـــەی کە مرۆڤەکان دەبێت هەڵگری بـــن، تەنها دایکم شـــك دەبرد کە لە دەربڕینە هەستیارەکانی من دەگەیشت، بەڵام خۆ دایکم نەیدەتوانی هەمـــوو کاتەکانم بۆ پڕ بکاتەوە، ئەو خەندانەی کە دایکـــم دەریدەبڕین ڕووی لە چاوانی مـــن دەکرد هەموویان پڕ بوون لە بەزەیـــی لە ناخەوە، دایکە نەك هەر پێکەنین بوونـــی نەبوو بەڵکو گریەیەکی گەورە لەســـەر دڵی دروست ببوو، کە ئاخۆ ژنێکی پیری وەها پرچەکانی دیمەنە نەهامەتییەکانی هەڵەبجە وەکـــو بەفـــری لێکردبـــوون، چـــۆن بتوانێت پاڵپشـــتی ڕۆحـــی کۆرپەیەکـــی خەســـێنراو بە ژەهر بێـــت، قوتابییەکی پۆلـــی چوارەمی ســـەرەتایی بووم هەموو بەیانییەك دایکم بە میهرەبانییـــەوە ئامادەی دەکردم بۆ قوتابخانە بۆ ئەوەی هەســـت بە کەمی خـــۆم نەکەم بە پێچەوانەی بـــاوكو خوشـــكو براکانمەوە کە ئەوان زۆر گرنگیان پێ نەدەدام، دەیانزانی کە من مرۆڤێکی تەندروست باش نیم بۆ خوێندن، هەر زوو ئیرادەیان دەربارەی خوێندنی من لە دەســـت دابوو، ئەو بەیانیەی کە تازە خۆر لە پەنجـــەرەی ژوورەکەمەوە خوێ هاویشـــتبووە سەر جێگاکەم گەرمی تیشکی خۆرەکە بە نێو چاوانم کەوتبوو ئەو منی لە خەو ڕاچڵەکاند، خێرا سەیری کاتژمێری ژوورەکەم کرد ماوەی نیـــو کاتژمێر لە کاتـــی قوتابخانەم لای دابوو، ئێوارەکـــەی دایکـــم نەخـــۆش بـــوو بـــە هۆی نەخۆشـــییەوە نەیتوانیبوو خەبـــەرم کاتەوە، خێـــرا جلوبەرگـــی قوتابخانـــەم لەبەر کردو جانتاکەم کردە شانمو چوومە پێشەوە بۆ لای دایکم لە ســـەر جێگاکەی کەوتبـــوو ماچێکی نێـــو چاوانی کـــردمو هەناســـەیەکی ئاگراوی هەڵکێشاو پێی گوتم: کوڕم درەنگە تازە ئەمڕۆ مەڕۆرەوە، لەبەرئەوەی من ئەوەندە شـــەیدای قوتابخانـــەو هاوڕێکانم بووم کە لەوێ یاریان دەکـــردو پێدەکەنین، حەزم دەکـــرد بەردەوام لەوێ بم، کاتێك هەنگاوم دەنا تا زیاتر نزیکی قوتابخانـــە دەبوومەوە زیاتر دڵم لێی دەدا بە تەواوەتـــی شـــڵەژابووم وەك ئـــەوەی کە چۆن شـــتێکی گرنگت لـــە ژیاندا لە دەســـت دابێت، کاتێك چوومە قوتابخانە جانتاکەم لە شانمدا دەرهێناو گرتمە دەســـتمەوە کە ســـەیرم کرد هەموو پۆلەکان سەرقاڵی خوێندنن، منیش لە پشـــتی دەرگای پۆلەکەی خۆمدا ڕاوەســـتابووم بە تـــرسو شـــەرمێکی زۆرەوە دام لە دەرگای پۆلەکەو چوومە ژوورەوە هەموو قوتابییەکان سەرســـام بوون، سڵاوم لە مامۆســـتا کردو بە چاوێکی پڕشەرمەوە پێم گوت: دەتوانم بێمە ژوورەوە مامۆستا پێی گوتم تۆ خۆ هاتوویتەتە ژوورەوە، بڵـــێ یارمەتی هەیە دابنیشـــم؟ من هەر لە بەردەم مامۆستا سەرنجم دەدا، تاوەکو ئـــەو میهرەبانی خۆی بە ڕووی مندا بکاتەوە، مامۆســـتا پێی گوتم بڕۆ بۆ ژووری بەڕێوەبەر لـــەوێ کاریان پێـــت هەیە، ئەگـــەر ئەو وتی: دوایی وەرە دابنیشـــە، بەڕێوەبـــەر پێی گوتم کارێکت کردووە مامۆستا زویر بووە لێت تۆی ناردووەتە ئێرە؟ گوتم نەخێر درەنگ کەوتووم، گوتـــی: تۆ دوو ســـاڵە لە پۆلێکـــدا کەوتوویت پێم وابـــێ بە کەڵکی خوێنـــدن نایەیت ئێمە بڕیارمـــان داوە تـــۆ بچیتەوە ماڵـــەوە، چونکە سروشـــتی تۆ لەگەڵ قوتابییەکاندا ناگونجێت خەریکـــە گەورە دەبیت مامۆســـتاکان گلەییان لـــە توانای تـــۆ هەیە، لەبـــەردەم بەڕێوەبەردا چەنددەهـــا قســـەم بۆ گوتن پێبـــوو، بەڵام ئەو لە قسە پچڕپچڕەکانی من نەدەگەیشت، گوتم بـــە بەڕێوەبـــەر من لـــە دەرەوەو کۆڵان کەس هاوڕێیەتیـــم نـــاکات لێـــرە هەرچۆنێك بێت خـــۆم تێکەڵیـــان دەکـــەم، من دڵم پێویســـتی بـــە هاوزمانێك هەیە کـــە هاوڕێیەتیم بکات، ئێســـتە من دوور دەخەیتەوە لـــەو دونیایەی کـــە من حەزم لێیەتی بە ناچاری دەســـتم لە جانتاکەم شـــل بوو، گەڕامەوە ماڵەوە هەستم دەکرد باوکمو خوشـــكو براکانم زۆر گرنگیم پێنـــادەنو تێڕوانینیان وەکو بەڕێوەبەرو باقی مامۆســـتایان بـــوو، بەڵام تەنهـــا دایکم خەمی بۆ دەخواردمو دڵنەوایی دەدامەوەو هەناســـەی قوڵـــی هەڵدەکێشـــاو چاوەکانی وەکـــو بارانی بەهاریـــان لێدەهات، بەڵام لە بێدەنگی دایکمو ئەو دیمەنانەی کە هەیبوون تێنەدەگەیشـــتم، ماوەی چەنـــد ڕۆژێك کەســـم نەبینیبوو زۆر بێزارو بێتاقەت بـــووم، دڵم ئۆقرەی نەمابوو، بڕیارمدا بچمە دەوروپشتی قوتابخانە بۆئەوەی سروشـــتی قوتابخانەکـــە ببینـــم، هەرچەندە هاوڕێکانـــم ئەو گرنگیەیـــان پێنەدەدام کە لە ناخمدا کۆببووەوە، هەمیشـــە بە ناوی ناشیاو بانگیـــان دەکـــردمو خۆیان لـــێ دوور دەگرتم، وەك ئـــەوەی کـــە چـــۆن کۆترێـــك ڕاوچیەك ببینێـــت خێرا لە شـــەقەی بـــاڵ دەداتو ئەو شـــوێنە بە جێدێڵێت ئەوانیش بەو شـــێوەیە بوون، بەڵام من هەر بیرم لای قوتابخانەو ئەو کـــوڕو کچانە بوون کە لەوێ بوون، کە چوومە لای قوتابخانەکە دیواری حەوشـــەکە بەرز بوو

نەمدەتوانی ببینم بە ناچاری گەڕامەوە، هەربیرم دەکردەوە بەرەو دەشتەکەی پشتەوە ڕۆیشتم لە ناکاو چاوم بە گوێدرێژێك کەوت کە لێی دەچوومە پێشەوە ئەو لێم هەڵنەدەهات، زۆر پێم سەیر بوو، چونکە هەمیشە مرۆڤەکان لێم هەڵدەهاتن ئیتر هەموو ڕۆژێك بە سواری گوێ درێژەکەمەوە دەچوومە لای قوتابخانە پۆلەکانو پەنجەرەکانیان لەسەر ڕووی ڕێگاکە بوو، دەمویست لە پەنجەرەی ژووری قوتابخانەکەوە لە نێوان دیواری ئەم دیوو ئەو دیوی ژوورەکەدا لە نێوان چەند ڕۆحێکو ڕۆحێکی پەراوێز کراو لە نێو دونیای حەزە ڕەشکراوەکانی خۆمدا دەگەڕام، بە یەك یەکی پەنجەرەکانی پۆلەکاندا تاوەکو نیگایەك، بەزەییەك لە چاوەکان، خەندەیەك لە لێوەکان بە ڕووی مندا واڵابکرێت، ئاوێتە بوونی من لەگەڵ ڕۆحەکانی تردا لەو دیوی دیوارێکی مردوو بە بێ ئەوەی ڕۆحەکان هەست بە خۆیان بکەن ئەو لەگەڵ ئەواندا پێدەکەنێت، هاوار دەکات من ڕازیم کە لەو دیوی پەنجەرەکەوە ژیانی نێو پۆلەکە ببینم بە خەیاڵ واقعییەتی خۆم لەگەڵ ئەواندا تێکەڵ بکەم سەیرم لەوە دەهات کە مرۆڤەکان ئامادە نەدەبوون کە هەڵسوکەوت لەگەڵ ڕۆحێکدا بکەن کە هەندێ لایەنی لە خۆیان کەمتر بێت، بەڵام گوێدرێژەکە ئامادە دەبوو هەموو ڕۆژێك بە سەر پشتییەوە دیمەنەکانی ناو پۆلەکە ببینم، سەیر نییە کە مرۆڤەکان لە هاوڕەگەزەکانی خۆیان یاخی دەبن پەنا دەبەنە بەر زیندەوەران بۆ ئەوەی بیان کاتە زمان حاڵی ناڕەحەتییەکانی خۆیان هەمیشە حەزم دەکرد وەکو منداڵەکانی تر یاری بە قوڕ بکەم و چاوشارکێیان لەگەڵ بکەم خانووی قوڕیان لەگەڵ دروست بکەم، بەڵام من بێبەش کرابووم لە هەموو شتێك دەترسام لە دەورووبەرم، چونکە بە ترس گۆش کرابووم سەیری منداڵەکانی کۆڵانم دەکرد دەمزانی دایكو باوکیان پێیان خۆش نییە یاری بە قوڕ بکەنو دارلاسیك دروست بکەن کەچی ئەوان حەزەکانی خۆیان نەدەکوشت لە دەرەوەی سنوری بڕیارەکانی ماڵەوە ئارەزووەکانی خۆیان جێبەجێ دەکرد، کاتێکیش زیانێکیان دەدا پێیان دەگوتن منداڵن، بەڵام من تەنانەت لەو حەزە سەرشێتیانەی منداڵیشم دیل کرابووم، بۆیە ئێستا گەورە بوومو پەی بە نهێنییەکانی خۆم دەبەم تۆ بڵێی مامۆستاو بەڕێوەبەر قوتابییەکانی خۆیان خۆشنەوێت؟ یان تۆ بڵێی باوکم منی لە سۆزی کۆرپەیی دەرکردبێت؟ یان خوشكو براکانم منیان لە بازنەی خۆیان کردبێتە دەرێ؟ ئەمە بۆ تۆی خوێنەر جێدەهێڵم دەبێت تاوانبار کێ بێت؟

# داوەری

شادی مەریوانی

(شیوانا) لەگەڵ قوتابییەکانی دانیشتبوو، باسی پیاوێکی دارتاش هاتە باس کردن، کە مێزو کورسیو ئیشی داری دروست دەکردو دەیفرۆشت. یەکێ لە قوتابییەکانی وتی: ئەو پیاوە دارتاشە زۆر پارە پەرستو دنیاویستە. ئەو ئاشقی پارەی زۆرەو هەموو ڕۆژی بۆ بە دەستهێنانی پارەی زیاتر خۆیو کرێکارەکانی دەخاتە ژێر فشارەوەو زۆر بۆ ئەو شتانەی دروستی دەکەن حەساسە.

(شیوانا) بە سەرسورمانەوە پرسی: تۆ چۆن دەزانیت کە ئەو کەسێکی پارە پەرستو دنیاویستە؟

قوتابییەکە وتی: زۆر ئاسانە! ئەو کاتێك کورسی بۆ کەسێك دروست بکات، لە پێشدا نرخی شتەکە دەڵێو قسەی لە سەر دەکاتو لەسەر لاپەڕەیەك ناونیشانی جۆری کورسیو کڕیار دەنوسێو پێی واژۆ دەکات، لە دواییدا بە چاکترین دارو بە سەرنجێکی زۆر جوان کورسییەکی باشی بۆ دروست دەکاتو دوای تەواو بوون واژۆی هەڵگرتن لە کڕیار وەردەگرێتو ئەو پارەیەی کە پێشتر لە سەری ڕێك کەوتبوون بێ ئەوەی هیچی لێ کەم بکاتەوە پارەکەی لێ وەردەگرێ.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە ئەو هەر جارێك تەنها یەك ئیش قبوڵ دەکات. خراپ نییە کە بزانین ئەو لە بۆنەی جوانی ئیشەکانی ناوبانگی دەرکردووەو هەموو کەس داوای ئیشو کاری لێ دەکەنو دارتاشەکانی تر تەنها ئەو کارانەی کە ئەو وەری ناگرێو دەمێنێتەوە چاکی دەکەن.

(شیوانا) لە کاتێکدا نەی دەتوانی توڕەیی خۆی بخواتەوە وتی: لە بەرئەوەی ئەو لە پێشدا پارەی کارەکەی دیاری دەکاتو لە کۆتاییدا کاتێك کارەکەی تەواو کرد هەموو پارەکەی بە تەواوی لە کڕیار وەردەگرێ، تۆ پێی دەڵێیت: پارە پەرستو دنیا ویست؟ چەند بە لێهاتوویی داوەری دەکەن!

قوتابییەکە وتی: باشە ئەو چ کاتێك دەیتوانی دنیاویست بێ؟(شیوانا) وتی: زۆرسادەو ئاسانە! ئەگەر لە سەر نرخەکەی لە پێشدا ڕێك نەکەوتایەو تەنها لە خۆیەوە نرخێکی دادەناو لە دواییدا دەیتوانی نرخەکەی بباتە سەرو پارەیەکی زیاتر لە کڕیار وەربگرێت، یان ئەگەر جۆری دروستکردنی شتەکەی لە کڕیار نە دەپرسیو دواتر خۆی بە زۆر شتێکی کە بە دڵی کڕیار نەبوایەو پێی بدایەو پێی دەوت خۆت وتوتە بەو جۆرە بێ، ئەگەر لە سەر کارەکەی وردەکاریو بە سەرنجو جوانیو حەساسەوە نەدەبوو، چەند شتێکی لە یەك کاتدا وەردەگرتو دەیگرتە ئەستۆی خۆی بێ ئەوەی لە توانایدا هەبێ، خۆی کارەکانی چاودێری نەدەکردو کارەکانی بە کرێکارەکانی دەسپارد، یان ئەگەر لە سەر جۆرو باشی شتەکان دوودڵ نەدەبوو، تەنها ئەو شتانەی نرخیان هەرزان بوایەو باشیو خراپی بەلاوە گرنگ نەبوایە ئەو کاتە دەتوانی پێی بڵێی پارەپەرستو دنیاویست. ئەمانە کە تۆ وتت ناونیشانی کەسێکی پاكو کار جوانە کە بە ڕاستگۆییو ڕاست کرداری بژێوی پێ دەباتە سەرو تەنها کەسێکی ڕێگە زاناو لێزانو ئەهلی مەعنەویەت دەتوانێ بەم جۆرە کارو هەوڵدان بکات، نیشانەکانت لەگەڵ ئەوەی کە وتت هاوسەنگ نین.

سەرچاوە: موفقیت.

# چۆن دەبیتە هاوسەرێکی نموونەیی؟

بۆ ژنان

بەشی پێنجەمو کۆتایی

**بول ریزر:** رێککەوتین لەسەرئەوەی کە گفتوگۆ لەسەر بابەتە ناخۆشەکان راستەوخۆ پێش نووستن نەکەین، بەڵام هەندێ کەس هەیە کە زۆر بەپەرۆشی قسەکردنەوەن تەنانەت کاتێك فڵچەی ددان شتنەکەش لە دەمیاندایە.

**جون ٧٢ ساڵ، ٢٠ ساڵ چۆتە نێو ژیانی هاوسەرگیری دووەم:** تکایە بە پەرۆشەوە گوێم بۆ بگرە، تا ئەوەی پێت دەڵێم لە یادی نەکەیت، هەروەها بۆئەوەی وتەکانم چەند جارێك دووبارە نەکەمەوە، لەبەرئەوەی وا هەست دەکەم وەك جاران گرنگی بە گوێگرتن نادەیت، تکایە بەسە لە وتنی «ئەی ئەگەر رووی نەدا»!.

**جیمس ٤٥ ساڵ، ١٣ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** ئارام بگرە هەتا فێرببیت بگەیتە راستی، لەبەرئەوەی کەسایەتی تۆ رانەهاتووە لە گوێگرتنو تێگەیشتن بە باشی. توانای تۆ بە گەیشتنی دڵو عەقڵت کلیلێکی هەیە کە دەتوانێ دەرگا داخراوەکان بکاتەوە.

**روبرت ٤٣ ساڵ، ٧ ساڵە خێزاندارە: من نازانم کێ وتوویەتی:** هەرکاتێ تۆو هاوسەرەکەت لەیەکتر تووڕەبوون، یەکسەر مەچنە سەر جێگای نووستن، من گومانم هەیە لەو کەسە ئەگەر هاوسەرگیری کردبێت، بەڵام لە بیرت بێت ئەگەر ئێمە هەردووکمان تووڕە بوینو پێکەوە چوینە جێگای نووستن ئەوە ئاماژە نییە بۆ ئەوەی کە ئێمە لەڕێی جیابو نەوەداین.

**لیام نیسون:** «گومانی تێدا نییە کە لە نێوان هاوسەراندا ناکۆکی روودەدات، ئەگەر هیچ شتێك رووی نەدا ئەوە ئاماژەیە لەسەرئەوەی کە پەیوەندییەکی یەکسان یان دروستیان نییە لە نێوانیاندا، بێگومان هەندێك هەڵچوونو ناکۆکی لە نێوان هاوسەراندا روودەدات»

**نیل ٤٧ ساڵ، ١٢ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاسەرییەوە:**

کاتێك کە دەمەوێت بچمە سەر جێگەی نووستن پاش ئەوەی کە تۆ دەچیت، مانای ئەوە نییە کە خۆشم ناوێیت، بەڵکو مانای ئەوەیە دەمەوێت دوای تۆ بچمە سەر جێگە.

**رولاند ٤١ ساڵ، ٥ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** هیوادارم سور نەبیت لەسەر ئەو کارەی دەتەوێ جێبەجێ بێت لە ساتێکی کەمدا، بەڵکو بە لایەنی کەمەوە هەوڵ بدە بزانیت ئایا ئەوە لەگەڵ کاتی ئێمەدا گونجاوە یان نا.

**توبی ٣٣ ساڵ:** پێویستە دەرك بەوە بکەیت ئانو زەمانی تۆو هاوسەرەکەت جیاواز دەبن، پێت وانەبێت هاوسەرەکەت مەکانەتی خۆیت پێ ببەخشێت تەنها لەبەرئەوەی تۆ دەڵێیت ساتی دەست پێکردنی کارێك دەستی پێ کردووە.

**برادلی ٥٤ ساڵ، ٣٦ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** لە ئامادەباشی دابن بۆ وەرگرتنو قبوڵ کردنی چارەسەر کردنی کێشەکانتان، پێویستە یەکگرتنێکی پتەو هەبێت لەنێوانتاندا، هاوسەرگیری هاوشێوەی بەلەمێکی سەوڵدارە ئەگەر هەردوولا بەشداربن لە سەوڵ لێدان بێگومان بەرەو پێشچوونی گەورە بە خۆیانەوە دەبینن.

**سکوت ٤٤ ساڵ، ١٥ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** پێویستە ئەوە قبوڵ بکەیت کە هەندێ شتی تایبەت بە پیاوان هەیە پێم خۆشە جێبەجێیان بکەم، هەرکاتێ لەئەنجامدانیان دەمبینیتو خۆشحاڵم، ئەوا تۆش بەو شێوەیەی کە پیاوێکی دوواکەوتووم لە چاخی بەردینەوە هاتبم سەیرم مەکە.

**ایریك ٢٨ ساڵ، ٦ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** کاتێك بۆ وەرزش کردن یان بۆ بەسەر بردنی کاتەکانم لەگەڵ هاوڕێیان دەچمە دەرەوە، ئەوە ناگەیەنێت من هیچ شتێکم لە تۆ سەندبێت، بەڵکو تۆ شتێکم پێ دەبەخشیت کە پێویستم پێی هەیە، ژنان پێویستیان بە چەپکە گوڵێکە، وانییە؟؟

پیاوانیش پێویستیان بە هەندێ کات هەیە کە بە ئازادیو بێ بەهانە هێنانەوە بە تەنها بچنە دەرەوە.

**لاری ٤٦ ساڵ، هاوسەرگیری دووەم ١٨ ساڵ:** هانی هاوسەرەکەت بدە بۆ گەشەو برەودان بە گرنگی پێدانەکانی لە دەرەوەی سنوری پەیوەندییەکانتان، ئەو دوولایەنەی هاوشێوەو وەك یەك وان ناتوانن ببنە یەك جەستە، بەڵام دووجەستەی تاك دەتوانن ببنە یەك بەرە.

**ستیفن ٣٠ ساڵ، ٨ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** لە پێناو دانانی پەیوەندییەکی درێژ خایان بوونی ژیانێکی کۆمەڵایەتی سەربەخۆ زۆر پێویستە، بۆ ئەوە ئاماژە بۆ یاری تۆپی پێ لە ئێوارانی یەك شەممە دەکەم لەگەڵ هاوڕێکانم.

**میتشل ٥٠ ساڵ، ٦ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** رووبەرێك لە ئازادیم پێ ببەخشە، سەرسام مەبە کە ئارەزووم لە بەسەربردنی هەندێك کاتە بە تەنها بێ ئەوەی تۆم لەگەڵدا بیت.

**جاری ٤١ ساڵ، ١٢ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** هەرکاتێك ئارەزووی ئەوەم هەبوو خاوەنی رووبەرێك لە ئازادیو تایبەتمەندی خۆم بم، ئەوە ناگەیەنێت کەمن تۆم خۆش نەوێت یان بمەوێت لێت دووربکەومەوەو بەجێت بهێڵم، بەڵکو هەموو ئەوەیە من دەمەوێ شپرزەییو پەرشو بڵاوی خۆم کۆبکەمەوەو هزرم ئارام بێتەوە.

بەشی پێنجەمو کۆتایی

# چۆن دەبیتە هاوسەرێکی نموونەیی؟

## بۆ پیاوان

**مارین ٦٢ ساڵ، ٢٢ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** ناوبەناو هەڵسە بە ئامادەکردنی خواردنی ئێواران، هەڵبەت میوانداری کردنی هاوسەرەکەت بۆ نانخواردن لە دەرەوە شتێکی جوانو سەرنجڕاکێشە، بەلام لەویش جوانترو دلگیرتر ئەوەیە کە لەماڵ بمێنیتەوەو کەسێك هەبێت نازت بکێشێتو خواردنت بۆ ئامادە بکات.

**ئیلینا ٣٧ ساڵ، ١١ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** کاتێك کە کاروبار لە سنووری کۆنترۆڵ کردن دەردەچێت هەست بە بێزاری مەکە، بەڵکو بە گیانی گاڵتە ئامێزو یاری کردنەوە مامەڵە بکە، چونکە لە کۆتاییدا ئەو شتانەی کە خۆشت دەوێنو عاشقیان بوویت منو منداڵەکانو ماڵەکەمانین، کە دەبنە هۆی ئەوەی هەندێکجار کاروبار لە سنوری کۆنترۆڵ کردن بترازێت.

**ئامی ٣٢ ساڵ، ٢ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** چاککردنی هەر شتێك لە ماڵەکەماندا بەشێکە لە ژیانمان، کەواتە تکات لێ دەکەم کاتێك دەسکی دەرگاکە دەشکێو دەکەوێتە خوارەوە وا هەڵسوکەوت مەکە وەك ئەوەی کە دنیا هەمووی بەچوار دەورتا هەرەسی هێنا بێت.

**ماری ٣٥ ساڵ، هاوسەرگیری دووەم ١٢ ساڵ:** پیاوی نموونەیی ئەو کەسەیە کە بەردەوام هێمنو ئارامو ژیرە، کاتێك خۆی ون دەکات بە شوێن ئاڕاستەکاندا دەگەڕێت، کاتێکیش کلیلەکانی ون دەکات شوێن پێیەکانی خۆی هەڵدەگرێو ژیری خۆی دەخاتە کار تابیان دۆزێتەوە، چونکە ئەو هەرگیز رێ نادات شتە بچوکەکان تووشی بێ هیوایی بکەنو دەستی بەسەردا بگرنو دەستەوسانی بکەنو کێشە بۆ هاوسەرو خێزانەکەی دروست بکەن.

**جین ٤٢ ساڵ، ١٢ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** رۆژانە بە نەرمو نیانیو ناسکی هەڵسوکەوت بکە.

هەفتانە تورەکەی زبڵو پاشماوەکان بەرەو دەرەوەی ماڵ فڕێ بدە.

**فیکتۆریا ٣٠ ساڵ:** هەوڵبدە ئەگەر بۆت گونجا رۆژانە بە هاوسەرەکەت رابگەیەنیت کە ئەو کارانەی ئەو پێی هەڵدەستێ تۆ بە گرنگی دەزانیو زۆر سوپاسی دەکەیتو چاکەی ئەوت هەمیشە لەبەرچاوە.

**باربرا ٦٨ ساڵ، ٤٩ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** لەبەرچاوی خەڵك شەرمەزارم مەکەو گاڵتەم پێ مەکە.

**بینی ٤٠ ساڵ، هاوسەرگیری دووەم ١٥ ساڵە بەردەوامە:** لە بەرامبەر خەڵکی یارمەتیم بدەو لایەنگیری خۆتم بۆ دەرببڕە، کاتێك هەردوکمان تەنیاین ئەوسا گفتوگۆ لەسەر خاڵە جیاوازەکانی نێوانمان دەکەین.

**ماری ٢٩ ساڵ، ١٢ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** با خۆشەویستیت پاڵنەرێك بێت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانم هەوڵبدە جڵەوی ئاواتەکانم بگری لە ترسی ئەوەی لە دەستم نەدەی، بەڵکو یارمەتیم بدە کە بەردەوام ئەو کەسە خاوەن هیواو ئامانجە بم کە کەوتویتە دوای خۆشەویستییەوە.

**جیل ٣٨ ساڵ، ١٤ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** تۆ هەرگیز بە تەواوی درك بەو هەموو ماندووبوونە ناکەی کە تووشی دەروونو عاتیفەو مێشكو لاشەم دەبێت بە هۆی پەروەردەکردنی منداڵو بەڕێوەبردنی کارەکانم، تۆ هەوڵ بدە تەرکیز بکەیتە سەر ئەو نۆسەدو نەوەتونۆ کارەی دەیکەم نەك ئەو تەنها کارەی کەبیرم چووەو ئەنجامم نەداوە.

**لیندا ٤٨ ساڵ، ٢٨ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** کاتێك پێت دەڵێم: دەمەوێت بە تەنیا بم لانی کەم هەوڵبدە بزانی کە بەڕاستی ئەوەم مەبەستە، یاخود دەمەوێت لە بارەی گرفتەکەمەوە قسە بکەم، چونکە من هەندێکجار نازانم کە کامیانم مەبەستە.

**بیث ٣١ ساڵ، ٥ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** کاتێك لە ناکاو تووشی تەوژمێکی هەڵچوونو تووڕەبوون دەبم ژوورەکە جێ مەهێڵە، بەڵکو گرنگیم پێ بدەو لە تەنیشتمەوە دانیشە، لە گەڵمدابەو هاوبەشی هەستو سۆزم بکەو لە ئامێزی خۆتم بگرە کاتێك دەست بە گریان دەکەم.

**گلۆریا ٥٠ ساڵ، بێوەژن:** ئەو کاتانەی کە تێیدا هەست بە پەشێویو پاڵەپەستۆی توندی دەمارەکانم دەکەم، تکات لێ دەکەم هەوڵ بدە بە وتەو گوزارشی جوانو ناسك هێمنم بکەیتەوەو یارمەتیم بدەی بۆ دووبارە گەڕاندنەوەی هاوسەنگیم.

**مارشا ٥٠ ساڵ، ٤ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** (دوای تەمەنی ٤٠ ساڵی): هەرگیز هەوڵ مەدە کۆنترۆڵی هاوسەرەکەت بکەیت چونکە ئەو خاوەنی بیرکردنەوەو عەقڵی سەربەخۆی خۆیەتی بێ ئەوەی پشت بە تۆ ببەستێت، ئەو پیاوانەی کە رۆحی زاڵبونیان تێدایە شتەکان بە تەنها بە رەشو سپی دەبینن (من لەسەر هەقم، کەواتە بێگومان دەبێت تۆ هەڵە بیت، لە واقیعیشدا پێویستە لەسەر هەردوولا واز لە کەسایەتی خۆمان نەهێنین لە هیچ پەیوەندییەکداو نابێت ئەم داوایە لە یەکتر بکەین).

شێخانی

له كاتێكدا باوكەكە خەریكی سڕینەوەو پاكردنەوەی ئۆتۆمبیلە نوێیەكەی بوو، كە زۆر دڵی پێ خۆشبوو!

لەو كاتـەدا كوڕە حەوت سـاڵانەكەی لـە دیوی ئـەو دیوەوە، بـە بەردێكی تیژ خەریكی رووشـاندنی ئۆتۆمبیلەكە بوو·· باوكەكـە لـە تاوا خەریك بوو شـێت بێ، بەوپـەڕی توڕەییـەوە·· بـێ بەزەییانە·· بـە ئیسـپانەیەك تا هێـزی تێدابوو، دای بە دەسـتی كوڕەكەیدا·· كوڕەكە ئازارێكی زۆری پێگەشتو خوێن لە پەنجەكانیدا زاو دەستی شین هەڵگەڕا·

بەپەلـە گەیاندیانە نەخۆشـخانە، بەڵام بەداخـەوە لێدانەكـەی باوكی بـوو بە هۆی ئەوەی یەكێك لە پەنجەكانی ببڕنەوە·

كاتێـك كـوڕە بچكۆلەكە بەنـج بەریداو هۆشی هاتەوە، بینی وا پەنجەیەكی بڕاوەتەوە، بـە بەڕائەتی منداڵانەوە رووی كردە باوكی و گوتی: باوەگیان كەی پەنجەم دەڕوێتەوە؟!

باوكەكە زۆر نیگـەران بوو·· زۆر لەو كارەی پەشـیمان بوو··· هەسـتی كرد كە تاوانێكی گـەورەی ئەنجامـداوەو نەدەبوا بۆ شـتێكی وەها بێ نرخ·· ئەو كارەسـاتە بەسەر جگەرگۆشـەكەیدا بهێنێت! ئاواتی دەخواسـت ئۆتۆمبیلەكـەی وردو خـاش ببوایەو كوڕەكەی هیچی لێ نەهاتبایە!

ئەوەی زیاتر نیگەرانی كردو ئاگری لە دڵـی بەردا·· ئەوە بـوو كاتێك گەڕانەوەو لە نزیكەوە سـەرنجی لەو شـوختە دا كە كوڕەكەی لەسـەر ئۆتۆمبیلەكە بە نووكی بەردێكی تیژ كێشابووی·· ئەم دێڕە بوو:

**بابەگیان خۆشم دەوێت·**

ئەم چیرۆكە زۆر سـەرنجی راكێشامو زۆر هەڵسوكەوتـی نێگەتیڤـی نێـو كۆمەڵگەی كوردەواری هێنامەوە یاد·

تووڕەبوونـی بێسـنوور لـەو منداڵە ناسـكوبێگەردانە·· كـە هەندێجـار وەك هەورەگرمـە بەسـەر منداڵەكانمانـدا دەگرمێنینو ئەوانیش لە ناخەوە هەسـت بە ترسو دڵە ڕاوكێو نیگەرانی دەكەن·

كۆنتـرۆڵ لـە دەسـت دان لـە كاتی رووداوە كتوپڕەكانداو نواندنی هەڵوێستی زۆر نابەجـێ، كـە لە دواییدا هەسـت بە پەشیمانی دەكەین، چونكە هەست دەكەین كـە برینێكـی قووڵمـان جێهێشـتووەو سارێژكردنی زۆر مەحاڵە·

بە داخـەوە تووڕەبـوونو هەڵچوونو بـە پەلە بڕیار دانو بەپەلـە هەڵەكردن، سیمایەكی بڵاوی نێو كۆمەڵگەی ئێمەیە·

خۆزگە بمان توانیبا خۆمان لەسەر هێمنیو لەسـەرخۆییو ئارامی رابهێنیـن·· بۆئەوەی لە كاتی تووڕەبوونو هەڵچووندا، كردارو گوفتارێك نەنوێنین كە بۆ هەمیشـە پەنجەی پەشیمانی لـە دوا بگەزین· هاوكات با وریای ئەوەبین كە جگەرگۆشـەكانمان پەپوولە ئاسـا زۆر ناسكنو تووڕەبـوون شـوێنەواری خراپیـان لەسـەر جێدەهێڵێـتو كاریگـەری خراپی لەسـەریان هەیەو دواتر گیرۆدەیان دەكات··

ئەوان پێویستییان بە گرنگیو میهرو سۆزی بێ سنووری ئێمە هەیە، ئەو كارەی ئێمـەش زریانێكی بـێ بەزەییەو چرۆی دڵنیاییو ئارامییان هەڵدەوەرێنێ·